جا هەر گەل و میللەتێك، لە گەل و میللەتی كوفر، كۆ ببنەوە لەسەر هەر نیزام و مەنهەج و دەستورێك، كە موخالەفە و دژایەتی دین و ئایینی ئیسلام بێت، ئەوە دین و ئایینی ئەوانە كە پێی رازی بوون ...، ئەمەش هەموو موسەماو بەرنامەكانی دیكەی وەك: (( شیوعی یەت و، ئیشتراكی یەت و، عەلمانی و بەعسی و، هاو شێوەیان)) ئەمانە و هەموو ئەو بەرنامە و مەنهەج و مەبدەئانەی كە داهێنراون و خەڵكی بە عەقڵ و فكری ژەنگاوی و قێزاوی خۆیان هەڵیان بژاردووە و دایان رشتووە و لەسەری رازین و بە چاكی دەزانن دەگرێتەوە، واتە ئەمانە گشت دەچنە نێو بازنەی دین و ئایینەوە، وە بەمەش دەبێتە دین و ئایین یان، وەك دین و ئایینی یەهود و نەصارا و زەبوور و صابیئە و ئیسلام، وە لەوانەش كە دین و ئایینە وەك دین و ئایینەكانی دیكە، بریتیە لە دین و ئایینی (**دیموكراسی**)، وە لێرەوە بۆمان دەردەكەوێت، كە (**دیموكراسی**) ئاینێكی جیاوازە لە ئایینی خوای گەورە، وە لێرەوە كۆمەڵێك دەستەواژە و كەلیمات باس دەكرێت و دەخرێتە پێش چاوت، كە تەعبیرن لەم ئایینە گومرایی و چەواشە كاری یە، كە زۆربەی خەڵكی شوێنی كەوتوون و شەیدای بوون و بەهۆیەوە سەریان لێ شێواوە و گومرا بوون، بەڵكو زۆرێك لەوانەی كە خۆیان داوەتە پاڵ ئیسلام، هەتا زۆر بەچاكی بزانن كە ئەم دینە (دیموكراسی) رێباز و میلەتێكە جگە لە رێباز و میلەتی یەكتاپەرستی و رزگار بوون، وە رێگەیەكە لە رێگە دەرچووەكان لە رێگەی حەق و راستەقینە، كە شەیتان لەسەر رێگای هەر یەكێك یان وەستاوە و بانگەواز دەكات بۆ ئاگر، واتە ئەم رێگا رێگای بەرەو ئاگرە، جا تۆش دوور بكەوە لەم رێگایە، وە بانگی خەڵكیش بكە بۆ دوور كەوتنەوەی ...

تذكيرا للمؤمنين ... بیر خستنەوەیەك بۆ ئیمان دارەكان.

و تنبيها للغافلين ... وە ئاگادار كردنەوەیەك بۆ بێ ئاگاكان.

و إقامة الحجة على المعاندين ... وە بیانو بڕ كردنی كەللە رەق و سەرپێچی كارەكان.

و معذرة إلى رب العالمين ... وە داوای لێ خۆشبون لە خوای جیهانەكان .

## باسی
## ديموكراسی دين و ئايينێكی كوفری داهێنراوه
## وه ديموكراسيەكانيش له نێوان چەند پەروەردگارێكی شەرع دانەر و چەند شوێنكەوتەيەكدان كه دەيان پەرستن

بزانـه، كـه دەبێـت لـه سـەرەتادا ئەصـل و بنچـينەی ئـەم وشـه پيسـه (الديمقراطيـة) ديموكراسی بزانيت، وه پێش ئەوەی هيچ ڕوونكردنەوەيەك بكەين لەسەر ئـەم باسـه، پێويستـه سـەرەتا زۆر بـه باشـی لـه واتـاو مانـای ئـەم وشـه (الديمقراطيـة) ديموكراسـی، تێبگـەيت، هـەتا وەرگێڕو موتەرجيمه سەر لێ شێواوەكان واتای راستـی ئـەم وشـه (غـەربی يـه) لـه پـێش چاوی خەڵكی دا نەشێوێنن و، چەواشەيان نەكەن به مانا و واتای ديكەی درۆيينـه، و بيڕازێننـەوه بـه واتا و مانای ديكه و له پێش چاوی خەڵكه نەزان و داماوەكەدا بيكەنه ئايەتی قورئان ...

بزانه كه له ئەصل و بنەرەتدا ئەم وشه پيسه (الديمقراطيـة) وشـەيەكی (عـەرەبی يـان كوردی) نييه، بەڵكو لـه بنەرەتـدا وشـەيەكی (يۆنانی)يـه، كـه ئـەم وشـەيه (الديمقراطيـة) يـان (Democracy) ، وشەيەكه له دوو بڕگه پێك هاتووه، ئەوانيش:

١. ديموس (Demos) واته: گەل يان ميلەت يان شەعب .
٢. كراتوس (Kratos) واته: دەسەڵات يان حوكم يان شەريعەت يان ياسا و دەسەڵات.

وه بـه گرێـدانی ئـەو دوو بڕگـه و دەمـج كردنـی بـەم شـێوازه : Kratos + Demos

وشەی (Democracy) دروست دەبێت، كه بەزوبانی عـەرەبيش پێـی دەڵـێن: (الديمقراطيـة كه واتاكەی : (حوكمی گەل) يان (دەسەڵاتی گەل) يان (شەريعەت و شـەرعی گـەل) دەگرێتـەوه، واته ئەو حوكمەی كه تيايدا تەواوی شەريعەت و دەسەڵات بۆ گەله، وەك له ڕەشنوسـدا هـاتووه

دەڵێت: (( أن الشعب هو مصدر السلطات، بما في ذلك السلطة التشريعية )). واتە: گەل سەرچاوەی تەواوی دەسەڵاتەکانە، هەتا بە دەسەڵاتی تەشریع و شەرع دانانیشەوە)).

ئەمە لە گەورەترین و گرنگترین خاسیەت و خەسڵەتی دیموکراسی (الدیمقراطي) یە، لەلای شوێن کەوتوەکانی، واتە (حكم الشعب للشعب) دەسەڵاتی گەل بۆ گەل .

لەبەر ئەمەش هەڵدەستن بە پڕوپاگەندە و بانگەواز کردن و وەسف و سەنا کردنی، ئەمەش برای یەکتاپەرست خۆی لە خۆیدا و لە بنەرەتدا، لە گەورەترین و تایبەت مەند ترین تایبەت مەندییەکانی شیرك و کوفر و باطیلە، کە دینی ئیسلام و ڕێباز و میلەتی یەکتاپەرستی هەڵدەوەشێنێتەوە خراپترین هەڵوەشاندنەوە، و دژایەتی دەکات خراپترین دژایەتی و بەر بەرەکانێ.

چونکە تۆ لە پێشدا زانیت و تێگەیشتی کە ئەو ئەصل و بنەمایەی خوای گەورە لە پێناویدا هەموو دروست کراوەکانی بەدی هێناوە و کتێبەکانی ناردووە، و پێغەمبەرانی ڕەوانە کردووە، وە کردویەتی یە گەورەترین بنچینە و کۆڵەکە لە ئیسلامدا بریتیە لە: (توحید العبودیة) یەکتاپەرستی بەندایەتی بۆ خوای گەورە، وە دوور کەوتنەوە لە بەندایەتی کەسانی دیکە ... چونکە گوێڕایەڵی و ئیطاعەت لە تەشریعدا لەو بەندایەتی و عیبادەتانەیە کە واجبە تەنها بۆ خوای تاك و تەنها بکرێت، ئەگەر نا ئەوە مرۆڤ لە موشریك و بە هەلاك چووەکان دەبێت .

ئەم تایبەت مەندییەی کە لەدینی (الدیمقراطي) دیموکراسیدا هەیە، (حكم الشعب للشعب) حوکم و دەسەلاتی گەل بۆ گەل، بە درێژایی مێژووی لە هیچ شوێنێکی دونیادا جێبەجێ نەکراوە و نەهاتۆتە دی و، سەرکەوتوو نەبووە، وە دینی دیموکراسی تەنها دەسەڵاتێکی چینایەتی زیاتر نەبووە، کە چەند چین و توێژێکی کەمینەی کۆمەڵگە، ئیرادە و دەسەڵات و ویستی خۆیان بەسەر تەواوی کۆمەڵگەدا دەسەپێنن، وەك وتویانە (دیکتاتۆری) یەو (دیموکراسی) نییە .

لە ڕابردوودا و لەلای (ئیغریقی) یە کۆنەکان، چینێکی پێك هاتە لە کار بەدەستان و گەورە پیاوانی قەوم و هۆزەکان، خاوەنی دەسەڵاتی (مطلق) گشتی شەرع دانەر و ئیرادەی

بەرزی خۆیان بوون، کەچی تەواوی ئەو خەڵکە ڕەش و ڕووتەی دیکە کە زۆرینە بوون، توانا و دەسەڵات وئیرادەی مێشولەیەکیشان نەبووە.

بەڵام لە چاخی نوێدا (عصر الحديث).[20] شێوازێکی دیکە هاتە ئاراوە، کە چەند چینێکی گەورە لە خاوەن سامان و سەرمایەی زۆر و دەوڵەمەند، کە پێیان دەڵێن (الرأس ماليين) خاوەنی دەسەڵاتی موتڵەق و ئیرادەی بەرزی خۆیانن، وە هەر ئەوانن لە ڕێگەی حیزب و وەسائیل و دەزگاکانی ڕاگەیاندن و ئیعلامەوە دەتوانن ڕای گشتی بۆلای خۆیان و بانگەوازیان ڕابکێشن و بیکەنە ژێر کاریگەری بۆچون و تەشریعەکانی خۆیانەوە، لە کۆتاییشدا بە دەنگ و ڕای زۆرینە دەسەڵاتی موتڵەق و شەریعەت و ئیرادەی تەواوەتی دەبێتەماڵی سەرمایە دارەکان (رأس ماليين).

لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە دیموکراسی حوکم و دەسەڵاتی کەمینەیە نەك گەل و زۆرینە، وە دەسەڵاتی زۆرینە بۆ کەمینەیە، بەڵکو زۆرینەی گەل چەواشە دەکرێت لە پێناو کەمینەیەکی خاوەن سەرمایە و سامانێکی زۆر، یان لە پێناو حیزب و تاقم و دەستەیەکی کەمینە بۆ بەجێ هێنانی مەرامە گڵاوەکانیان، و گەیشتن بە پەرلەمان و دارو دەستە شیرکی یەکەیان، ئەمەیە پێناسەی ناوەڕۆکی دیموکراسی، کە سەدو هەشتا پلە پێچەوانەی ڕواڵەتە کەیەتی...

جا دیموکراسی لە هەردوو ڕووەکەیەوە، کوفرە بە خوای گەورە و، هاوەڵ دانان و شیرکە بە بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی، وە هەڵوەشێنەرەوەی ڕێباز و میلەتی یەکتاپەرستی و دینی پێغەمبەرانە ، لەبەر چەند هۆکارێکی زۆر و جۆرا و جۆر، لەوانەش:

**یەکەم:** لەبەر ئەوەی (دیموکراسی) تەشریع و شەریعەتی زۆرینە و جەماهیر و جەماوەرە، یان حوکمی طاغوتە و حوکمی خوای گەورە نییە، وە خوای گەورە فەرمانی داوە بە پێغەمبەرەکەی (صلى الله عليه وسلم) بە حوکم کردن بەوەی کە بۆی ناردووە، واتە حوکم کردن بەو حوکمەی کە خوای گەورە بۆ پێغەمبەری ناردووە، وە ڕێگری لێ کردووە لە شوێن کەوتنی هەوا و هەوەس و ئارەزوی ئوممەت و جەماوەر و گەل، وە ئاگاداری کردۆتەوە کە

[20] ) کە بەراستی چاخی نوێ (الحديث) تەنها ناوە، ئەگەر نا لە واقعدا (عصر الحديد)ە ...!

توشی فيتنەی بكەن لە هەندێك لەو شتانەی كە خوای گەورە بۆی ناردووە، وە دەفەرموێت:
﴿وَأَنِ احْكُمْ بَيْنَهُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللهُ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ وَاحْذَرْهُمْ أَنْ يَفْتِنُوكَ عَنْ بَعْضِ مَا أَنْزَلَ اللهُ إِلَيْكَ﴾ المائدە٤٩). واتە: ئەی محمد (صلی الله علیه وسلم) هەر دەبێت لەناو هەموو خەڵكی و شوێن كەوتوانت و خاوەن نامە ئاسمانییەكان بەوە حوكم بكەین كە خوای گەورە بۆی ناردویت، وە نەكەیت شوێن هەواو هەوەس و ئارەزووی خەڵكی بكەویت، وە ئاگاداربە كە لات نەدەن و هەڵت نەگێڕن لە هەندێك لەو شتانەی كە خوای گەورە بۆی ناردویت لە حوكم و بڕیارەكانی)).[٢١]

ئەمەش لە ڕێباز و میللەتی یەكتاپەرستی و دینی ئیسلامدا.

بەلام لە دینی دیموكراسی و ڕێباز و میلەتی شیركدا بەندە و عەبیدەكانیان دەڵێن: ((وأن احكم بينهم بما ارتضى الشعب واتبع أهواءهم واحذر أن تفتن عن بعض ما يريدون و يشتهون و يشرعون )). واتە: حوكم و دادوەری بكە لە نێوانیان بەوەی كە گەل و شەعب پێی خۆشە و شوێن وهەوەس و ئارەزوەكانیان بكەوە، وە ئاگاداریش بە كە توشی فیتنەت نەكەن و هەڵت بخەڵەتێنن لە هەندێك لەو شتانەی كە دەیانەوێت و داوای دەكەن و دەیكەن بە شەرع و یاسا )).

ئاوا دەڵێن و دەفلتێنن ... ئەمەیە دەستور و بڕیاری دیموكراسی، واتە ئەمەیە بڕیاری دینی دیموكراسی، ئەمەش كوفرێكی ئاشكرا (بەواح) و شیركێكی ڕوونە ئەگەر جێبەجێی بكەن، لەگەڵ ئەمەشدا و لە راستی و واقیعدا ئەو بارودۆخەی تێیدان زۆر لەمە خراپ تر و بۆگەنترە، خۆ ئەگەر قسە بكەن و بدوێن لەسەر حاڵ و بارو دۆخیان دەڵێن: (( وأن احكم بينهم بما يهوي الطاغوت و ملؤه، ولا يسن تشريع ولا قانون إلا بعد تصديقه و موافقته)). واتە: حوكم و دادوەری بكەن لە نێوان یان بەوەی طاغوت و كۆمەڵ و دەست و پێوەندەكەی

---

[٢١] ) هۆكاری دابەزینی ئایەتەكە بۆسەر تاقمێك لە یەهودی یەكان دابەزی، ئەوانیش (ئیبن سوریا، كەعب، شاس) كاتێك كۆبونەوە و وتیان با بچین (محمد) لە خشتە بەرین، و پێی بڵەین لە مەسەلەی ڕەجمدا پشت گیری مان بكە و با ئەو حوكمە تەعتیل بكەین و لایبەرین، ئەوسا ئێمەش لە هەندێك شتدا بە گوێت دەكەین، خۆشت باش دەزانی ئەگەر ئێمە شوێنت بكەوین تەواوی هۆز و تائیفەكانی دیكەش شوێنت دەكەون، بەلام پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بە گوێی نەكردن، و حوكم و دادوەری گەڕاندەوە بۆ لای خوای گەورە ./ تەفسیری ئبین عەباس.

ئارەزووی دەکەن، وە نابێت هیچ یاسا و تەشریعێك دەربچێت و دابنرێت ئیلا دوای ئەوەی طاغوت پێی ڕازی دەبێت و پشت گیری دەکات!!)).

**هذا ضلال مبين واضح أبدا بل هو الشرك بالمعبود عدوانا**

**دووەم:** چونكە (دیموكراسی) حوكم و دادوەری زۆرینە یان طاغوتە، ئەویش بەگوێرە و لەسەر بنەمای (دەستور)، نەك لەسەر بنەمای شەریعەتی خوای گەورە، ئەمەش لە (دەستور) و كتێبەكانیاندا ئاماژەی پێ كراوە و نوسراوە.[٢٢]، كە زۆر لە قورئان بەرز و پیرۆز ترو موقەدەس تر رایدەگرن، بەو بەڵگەی كە حوكم و بڕیاری دەستور دەكەنە پێش حوكمی و، وە شەرعەكەی دەسەڵاتدارە لەسەر شەرعی قورئان.

لە دینی دیموكراسی دا گەل و جەماوەر هیچ دەسەڵات و حوكم و بڕیارێكی وەرناگیردرێت _ئەمە ئەگەر بەراستی دەسەڵات و تەشریع بۆ ئەوان بێت_ هەتا یەكسان و موتابیق نەبێت لەگەڵ مادەكانی رەشنوسی دەستور، چونكە دەستور بابە گەورەی تەواوی قانون و یاساكانەو، كتێبی پیرۆز و موقەدەسی یانە، وە لە دین و ئایینی دیموكراسیدا هیچ حساب و ئیعتبارێك بۆ ئایەتەكانی (قورئان) و (فەرمودە) كانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ناكرێت، وە قەت ناكرێت و نابێت هیچ مادەیەكی قانونی یان تەشریعی دابنرێت لەسەر بنەمای ئیسلام، ئیلا مەگەر هاوتاو موافیق بێت لەگەڵ كتێبە پیرۆز و موقەدەسەكەیان، واتە (دەستور)، ئەگەر باوەڕیش ناكەن ئەوە بچن بپرسن لەوانەی كە شارەزان لە قانون، ئەگەر ئێوە لەم قسە بە گومانن .

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الْأَمْرِ مِنْكُمْ فَإِنْ تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ إِنْ كُنْتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ ذَلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا ﴾ النساء ٥٩). واتە: ئەی ئەو كەسانەی باوەڕتان هێناوە، گوێڕایەڵی خوای گەورە و

---

[٢٢] مادەی (٥) لە رەشنوسی دەستوری هەمیشەیی عێراق هاتووە: (سەروەری بۆ یاسایە، گەلیش سەرچاوەی دەسەلات و شەرعی بونییەتی ).

هەروەها مادەی (٣) لە پرۆژە دەستوری هەرێمی كوردستان – عیراق هاتووە: (گەل سەرچاوەی دەسەلاْت و رەوا بوونیەتی، كە لە رێگای دام و دەزگا دەستوری یەكانەوە پیادە دەكرێت).

گوێڕایەڵی پێغەمبەر (محمد) و کاربەدەستەکانتان بکەن (ئەوانەی کە وەك ئێوە ئیمان دار و یەکتا پەرستن).[٢٣]، خۆ ئەگەر لە شتێکدا ڕێك نەکەوتن و نیزاع تان هەبوو، ئەوە بیگێڕنەوە بۆ خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی، واتە قورئان و سوننەت، ئەگەر ئێوە بەراستی ئیمان دارن و ئیمانتان بە خوای تاك تەنها و ڕۆژی دوایی هەیە، ئەوە چاکترین و خێرترین حوکم و سەرەنجام و پاداشتی هەیە )).

بەلاّم لە دینی (دیموکراسی)دا دەڵێت: (( فإن تنازعتم في شئ فردوه إلى الشعب و مجلسه و مليكه وفقا للدستور الوضعي والقانون الأرضي )). ئەگەر لە شتێکدا ڕێك نەکەوتن و نیزاع تان هەبوو، ئەوە بیگێڕنەوە بۆ حوکم و داد وەری گەل و ئەنجومەنی و سەرکردەکەی، بەپێی دەستورە دانراوەکەی و یاسا و قانونە زەمینی یەکەی !! )).

﴿أُفٍّ لَكُمْ وَلِمَا تَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ أَفَلَا تَعْقِلُونَ﴾ ألأنبياء٦٧ واتە: ئۆف (ئاخ) لە ئێوە و لەو شتانەش کە لە جێگەی خوای گەورە بەندایەتی بۆ دەکەن و دەیپەرستن، ئەوە ئێوە تاکەی عاقڵ نابن، تاکەی عەقڵ تان ناکەنە کار ؟)).[٢٤]

وە لەسەر ئەمە، ئەگەر تەواوی گەل و جەماهیر و جەماوەر بیانەوێت لە ڕێگەی دینی (دیموکراسی) و لە میانەی ئەنجومەنی شیرکی و تەشریعی یەکانیانەوە حوکمی شەریعەتی خوای گەورە بکەن، هەرگیز ناتوانن کاری وا بکەن، ئەگەر طاغوت ڕیگەش بدات پێیان، ئیلا مەگەر لە ڕێگای (دەستور) و مادە و دەقەکانی یەوە نەبێت، چونکە (دەستور) بریتیە لە کتێبە بەرز و پیرۆز و موقەدەسەکەی دینی (دیموکراسی)، یان بڵێ تەورات و ئینجیلە تەحریف و شێوێن راوەکەی بەگوێرەی شەهوەت و هەواو و هەوەسی خۆیان .

---

[٢٣] ) تێبینی: (**وَأُولِي الْأَمْرِ مِنْكُمْ**) ئەو کاربەدەستانە دەگرێتەوە کە وەك ئیمان دارانن، واتە یەکتاپەرستن و لە میلەتی ئیسلامن، و حوکم و دادوەری بە قورئان و سوننەت دەکەن، واتە حوکم بەدەستورەکان و یاسا دەست کردەکانی دیکەی وەك (دیموکراسی و عیلمانی و مارکسی و حیزبایەتی) ناکەن، ئەمەش نابێتە بەڵگە بۆ ئەو ئەحمەقانەی کە بەم کار بەدەستە مورتەدانەی ئەم زەمانە دەڵین ولات و ئەلئمور یان وەلی و ئەلئەمر، وە فەتوا دەدەن هەرکەس دەربچێت لێیان ئەوە خەواریجە، بەڵکو بە پێچەوانەوە دەرچون و شەر کردن دژی ئەم کاربەدەستە مورتەد و کافرانە وەك نوێژ و ڕۆژو واجبە .

[٢٤] ) خوای گەورە لە سەر زاری پێغەمبەر (ئیبراهیم)ەوە دەفەرموێت، کاتێك پێغەمبەر ئیبراهیم سەلامی خوای لێ بێت شیرك و خراپی پەرستنی طاغوت و بت و پەیکەرەکانی بۆ گەل و قەومەکەی ڕوون کردەوە.

**سێیەم:** هەر لە بنەڕەتدا (دیموکراسی) بەرهەم و ئەمەرەی (عیلمانی) پیس و خەبیث و، کـچ و مەلۆتکـە ناشـەرعی و زۆڵەکەیـەتی، چـونکە (عیلمانی)یـەت لـە بنەڕەتـدا: مەزهـەب و ڕێچکەیەکی کوفری و بێ باوەڕی یە، کە هەوڵ ئەدات بـۆ جیاکردنـەوەی دیـن و ئـاین لـە ژیـان، یان جیاکردنەوەی دین و ئاین لە دەوڵەت و حوکم و دەسەڵاتدا .

**وە (دیموکراسی):** بریتیە لە حوکم و دەسەڵاتی گەل، یان حوکم و دەسەڵاتی (طاغوت)، وە لەگشت حاڵەتەکاندا، یـان بـە هـەموو شـێوازەکانی یـەوە، حـوکم و داد وەری خـوای گـەورە و بـەرز و موتـەعال نییـە، بـەڵکو وەك باسمـان کـرد و زانیـت دینـی (دیموکراسـی) هـیچ حساب و ئیعتبارێك دانانێت بۆ شەریعەتی موحکەم و بێ کەم و کورتی خوای گەورە، ئیلا پـێش هـەموو شتێك دەبێت بگونجێت و موافیق بێت لەگەڵ مادەکانی (دەستور) دا.

وە دووەم شتیش دەبێت بگونجێت و موافیق بێت لەگەڵ هەواو هەوەس و ئـارەزوی گـەل و جەماوەر، وە پێش هەموو ئەمانەش ویست و ڕەغبەت و ئـارەزوی طاغوت یـان دارو دەسـت و پێوەندەکەی...

لەبەر ئەوە ئەگـەر هـەموو گـەل، یـان تـەواوی خـەڵکی و جـەماوەر و جـەماهیر، پێکـەوە بەیەك دەنگ بە (طاغوت) یـان ئـەرباب و خواکـانی (دیموکراسـی) بڵێن: ئێمـە دەمانـەوێت کـە حوکم بکرێت (**بما أنزل الله**) بەوەی کە خوای گەورە ناردویەتی، واتە ئێمە حـوکمی ئیسـلامان ئەوێت، وە نابێت هیچ کەس لەگەل یان نوێنەرەکانی لە (پەرلەمان) و ئەنجومەکانی تەشریع و شـەرع دانـان، یـان کـار بەدەسـتان و داد وەران، هـیچ مـاف و حـەقێکیان هـەبێت لـە تەشـریع و شـە رع دانانـدا بـەهیچ جۆرێـك .... وە دەمانــەوێت حـوکم و بریـاری خـوای گـەورە بەسـەر (مورتەد) ئەو کەسانەی لە ئیسلام هەڵدەگەڕێنـەوە، و ئـەو کەسـانەی زینـا دەکـەن و مەشـروب (مـاددە سـڕ کـەرەکان) دەخـۆن و دزی دەکـەن، جێبـەجێ بکرێـت، وە دەمانـەوێت حیجـاب و باڵاپۆشی و داوێن پاکی بەسەر ئافرەتاندا جێبەجێ بکـەین ، وە دەمانـەوێت ڕێگـری بکـەین لـە خۆ ڕازاندنەوە و تەبەروج و فجور و زیناو داوێن پیسی و نێربازی و جگـە لـەوانیش لـە فەسـاد و خراپەکاری و فەواحیشەکان، ئەوە یەکسەر پێیان دەڵێن: ئەوە دژی بنەماکانی دیـن و ئـایینی (دیموکراسی) و ئازادییەکانییەتی!!

چونكه وەك لە سەرەتادا باسمان كرد كە گەورەترين و تايبەت مەند ترين، يان گەورەترين بنەما و كۆڵەكەی دين و ئايينی (ديموكراسی) بريتيە لە دوو كۆڵەكە، يان دينی (ديموكراسی) خۆی لەسەر دوو كۆڵەكە گرتووە، ئەوانيش:

١. سيادە و دەسەلآتی گەل يان ئوممەت .
٢. دان پێدانان و ئيعتراف كردن بە مافەكانی تاك و ئازادی و حوری يەتی و پاراستنی .

ئەمەيە ... ئەمەيە حورِيەت و ئازادی دينی (ديموكراسی)، دەرچون و خۆ ئازاد كردن و تەحەرور لە دين و شەريعەت و سنورەكانی خوای گەورە ... بەلآم شەرع و ياسای (دەستور) ی زەمیینی و قانون و قەوانينی وەزعی و دانراوەكەيان، لايان پيرۆز و موقەدەس و پارێزراوە، لە دينە (ديموكراسی) يە كوفری و پيس و بۆگەنەكەياندا، بەڵكو هەركەس سنوری ببەزێنێ و پێچەوانەی بكات و دژی بوەستێتەوە و بەرەنگاری بێتەوە، سزا و عيقاب دەدرێت، توند ترين سزاو عيقاب، وەك خۆيان دەلێن (مەحكەمە) يان داد وەر (حاكم) برياری دا بە سزای (.....) بە پێی مادەی (...) لە رەشنوسی دەستور !

**فتبا لكم تبا لكم تبا لكم ⋆ تبا لكم حتى يكل لسان**

لەناو چون بۆتان لەناو چون بۆتان لەناو چون بۆتان

لەناو چون بۆتان هەتا ووشك بوون و لاڵ بوونی زمان

كەواتە برای يەكتاپەرست، بزانە كە **(ديموكراسی)** دين و ئايينێكە لە جێگەی دين و ئايينی خوای گەورە، وە حوكمی (طاغوت)ە لە جێگەی حوكمی خوای گەورە، وە تەشريع و شەريعەتی خواو ئەربابە بەش بەش و لەت و پەتەكانە لە جێگەی شەريعەتی خوای تاك و تەنها و بەهێز و بەتوانا (ئەلقەهار)، وە هەركەس ئەم شەريعەت و حوكمە شيركی و كوفری يە قبوڵ بكات و وەری بگرێت و پێی رازی بێت و تێكەڵی ببێت، ئەوە بەراستی قبوڵی كردووە كە مافی تەشريع و شەرع دانانی هەبێت، بەپێی مادە و موادەكانی دەستور، وە ئەو شەريعەتەی لا پێشتر بێت لە جێگەی شەريعەتی خوای گەورەی تاك و تەنها.

ئیتر جیاوازی نییه، ئەگەر دوای ئەمە تەشریع و یاسا دابنێت یان نا، وە دەربچێت و سەرکەوێت بە دەنگدان (ئینتخابات)ی شیرکی یان نا، چونکە دەست تێکەڵ کردن و بەژداری کردنی لەگەڵ موشریکەکاندا لەسەر دین و ئایینی (دیموکراسی)، و قبوڵ کردنی و ڕازی بوونی بەوەی کە حوکم و تەشریع بۆ ئەو بێت، وە دەسەلآت و سوڵتەی بەسەر کیتابی خوای گەورە و شەریعەتەکەیەوە بێت، ئەوە بۆخۆی بە ئاشکرا کوفر و لەدین دەرچوونە، وە گومڕایی و زەلاڵەتێکی ڕوون و ئاشکرایە، بەڵکو ئەوە (شیرك) و هاوەڵ دانانە بۆ خوا –پەرستراوی- بێ هاوەڵ و هاوتا .

لە دین و ئایینی (دیموکراسی)دا گەل ئەو ئەندام و نوابانە هەڵ دەبژێرن و دەیکەنە نوێنەری خۆیان، وە هەموو تاقم و تائیفە و کۆمەڵ و قەبیلە و بنەماڵە و حیزبێك ئازاد و سەر پشکن لەوەی کێ هەڵدەبژێرن و دەیکەنە (ئەرباب) پەروەردگاری خۆیان، لەنێوان ئەو هەموو (ئەرباب) پەروەردگارانەی دیکەدا، هەتا بە ویستی هەواو هەوەس و ئارەزوی خۆیان شەرع و حوکم وياسايان بۆ دەربکەن، و چییان حەزلێ بوو وایان بۆ بشەرعێنن، بەلآم وەك زانیمان دەبێت لەسەر بنەمای مادەکانی دەستور بێت و لە (نصوص)ی ئەو دەرنەچێت!!، واتە سنوری دەستور نەبەزێنێت، ئیتر لەم بەینەدا هەیانە نوێنەر (مەعبود) پەرستراوە شەرع دانەرەکەی هەڵدەبژێرێت بەگوێرە و لەسەر بنەمای فیکر و ئایدۆلۆژیای خۆی... جا یا ئەوەتا پەروەردگار (رَب) یێکە لە حیزبی فولانی، یان خوا (إله) یێکە لە حیزی عەللانی، وە هیواشیان تێدایە هەڵی دەبژێرێت بە گوێرەی هۆزگەرایی و خزمایەتی، یان ئەوەتا خوا (إله) یێکە لە هۆزی فولانی، یان بت (وثن) یێکی پەرستراوە لە خزمی فولانی، وە لە نێوانیشیاندا هەیە بە نیازی خۆیان خوایەکی (سەلەفی) هەڵدەبژێرن، وە هەندێکی دیکە خوایەکی (ئیخوانی) واتە (ئیخوان المسلمین) هەڵدەبژێرێن، یان پەرستراوێکی ڕیشدار، یان پەرستراوێکی بێ ڕیش هەڵدەبژێرن..[٢٥]

وە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ أَمْ لَهُمْ شُرَكَاءُ شَرَعُوا لَهُمْ مِنَ الدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنْ بِهِ اللهُ وَلَوْلَا كَلِمَةُ الْفَصْلِ لَقُضِيَ بَيْنَهُمْ ﴾ الشورى ٢١). واتە: ئاخۆ ئەو موشریکانە (ئەبو جەهل و شوێن

[٢٥] ) وەك ئێستا لە ولآتی کوێت هەندێك بەناو سەلەفی (تەلەفی) بە بستێك ڕیش و جزداشەیەکی کورتەوە چونەتە ناو پەرلەمان !!، و لە ولآتی (میصر)یش (ئیخوان ئەلموفلیس)ەکان لەناو پەرلەمان بانگ دەدەن !

كەوتوەكانى) چەند خوايەكى هاوبەشيان هەيە، كە بەرنامە و شەريعەتيان بۆ دادەنێن، لەوەى كە بۆيان نييە بيكەن و خواى تاك و تەنها ڕێگرى لىٚ كردوون، ئەگەر بەلێنى خوا نەبووايە بە دواخستنى سزا بۆ ڕۆژى دوايى، هەر زوو بڕيار درابوو لە نێوان ئەوان و ئيمان دارەكاندا، بە لەناو بردن و غەزەبى خواى گەورە بەسەر بىٚ ئيمان و موشريكەكاندا )).

جا ئەو نوێنەر و ئەندام (پەرلەمان)انە لە ڕاستيدا و لە بنەرەتدا، چەند بت (وَثن)ێكى دانراو، و (أصنام) پەيكەرێكى پەرستراو، و (آلهة) خوايەكى درۆينەو متمانە پىٚ نەكراون، لە پەرستگا و قەلاٚكانى بەندايەتى و پەرستنيان (واتە پەرلەمان)، كە خۆيان و شوێن كەوتوانيان ديندارييان بۆ دەكەن و، بە دينى (ديموكراسى) و شەرع و شەريعەتى دەستوور، حوكم و شەريعەتى بۆ دەگێڕنەوە بە پێى مادە و موادەكانى ڕەشنوس و دەقى دەستوور، وە پێش هەموو ئەمانەش خوا و پەروەردگارە گەورە كەيان يان بت و پەيكەرە گەورەكەيان، حوكم يان دەكات، يان پێش هەموو ئەمانە حوكم لاى ئەوە، هەر ئەوە يان ئەوەتا ڕەزامەندى دەنوێنێت لەسەرى يان نارازى دەبێت بە بڕيار و تەشريع يان، ئەويش بريتيە لە سەرۆك يان پێشەوا يان مەليك .

ئەى براى يەكتاپەرست (موەحيد) ئەمەيە كاكلەو ناوەڕۆكى ميللەت و ڕێبازى حەقيقەتى ديموكراسى ... بريتيە لە دينى طاغوت .... نەك دينى خوا ... وە ميللەت و ڕيبازى شيركە ... نەك ميللەت و ڕێبازى پێغەمبەران ... وە شەريعەت و شەرعى خوا و ئاليهەو ئەربابە جياواز و پەرتەوازەكانە ... نەك شەريعەت و شەرعى خواى تاك و تەنهاى قەهار .

وە خواى گەورە لە زارى پێغەمبەر (يوسف)ەوە (عليه السلام) دەفەرموێت: ﴿يَا صَاحِبَيِ السِّجْنِ أَأَرْبَابٌ مُتَفَرِّقُونَ خَيْرٌ أَمِ اللهُ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ * مَا تَعْبُدُونَ مِنْ دُونِهِ إِلَّا أَسْمَاءً سَمَّيْتُمُوهَا أَنْتُمْ وَآبَاؤُكُمْ مَا أَنْزَلَ اللهُ بِهَا مِنْ سُلْطَانٍ إِنِ الْحُكْمُ إِلَّا للهِ أَمَرَ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا إِيَّاهُ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾ سورەتى يوسف ٣٩-٤٠.

واتە: ئەى هەردوو هاوڕێى بەنديخانەكەم: ئاخۆ چەند خوايەكى جيا جيا (موتەفەريق) بپەرسترێن چاكترە، يان هەر يەك خواى تاك و تەنها و زاڵ و بە دەسەلاٚت بەسەر هەموو شتێكدا ؟؟ ئەوەش چاك بزانن ئەوانەى ئێوە لە جێگەى خوا دەيان پەرستن تەنها چەند

ناوێکى بىَ ناوەڕۆکن، ئێوە و باو و باپیرانتان بە ئارەزووى خۆتان ناوتان ناون و کردوتانن بە خوا/ وە خواى گەورە هیچ بەڵگەیەکى بۆ ڕاستى پەرستنى ئەوانە نەناردووە، وە هەموو حوکم و بڕیارێك تەنها و تەنها هەر هى خوایە، وە دەبێت تەنها هەر ئەو حاکم و بڕیار بەدەست بێت، وە فەرمانى داوە کە: ئێوە دەبێت تەنها بەندایەتى بۆ ئەو بکەن و ئەو بپەرستن و گوێڕایەڵى ئەو بکەن، نەك لە حیزب و عەشیرەت و گروپ و خێڵ ....، هەر ئەو ئاینە (یەکتاپەرستى) ڕاست و ڕەواو پایە دارە، کە پێم ڕاگەیاندى و بانگەوازم بۆ کردى، بەڵام زۆربەى خەڵکى نازانن کە ئایینى یەکتاپەرستى (تەوحید) ڕاست و ڕەوا یە )).

هەروەها دەفەرمویێت: ﴿أَإِلَهٌ مَعَ اللَّهِ تَعَالَى اللَّهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ سورةتى النمل٦٣.

کەواتە ئەى بەندەى خوا هەڵبژێرە ... یان دینى (خوا) و شەریعەتە پاکەکەى و چرا ڕووناکەکەى و ڕێگا ڕاستەکەى ... یان دینى (دیموکراسى) و شیرك و کوفر و ڕێگا لارو لەوێر و خراپەکەى ... حوکمى خواى تاك و تەنها و قەهار ... یان حوکمى طاغوتى ستەم کار .

﴿لَا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَدْ تَبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِنْ بِاللَّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَى لَا انْفِصَامَ لَهَا﴾ البقرة٢٥٦). واتە: زۆر لێکردن و ئیجبارى کردنى هیچ کەسێك لە خاوەن نامە ئاسمانییەکان (یەهود و نەصارا) ناکرێت بۆ یەکتاپەرستى و تەوحید دواى باوەڕ هێنانى عەرەبەکان، چونکە ئیمان و کوفر، یان و هەق و باطل، هەردووکیان ئاشکران و دیارى کراون، هەرکەس بىَ باوەڕ و کافر ببێت بە (طاغوت) واتە بە هەموو جۆرەکانییەوە، وەك گوێڕایەڵى فەرمانى شەیتان و پەرستن و بەندایەتى بت و دروست کراوەکان، وە باوەڕ و ئیمانى تەواوەتى بهێنێت بە خواى گەورە (الله) و ئەوەى ناردویەتى، ئەوە دەستى گرتووە بە پەت و کۆڵەکەى مەتینەوە (العروة الوثقى) واتە (لاإله إلاالله) کە پێى دەڵێن یەکتاپەرستى یان تەوحیدى خواى گەورە، وە هیچ کات ئەو پەت و کۆڵەکە مەتینە پچرانى بۆ نییە، یان هیچ کات خاوەنەکەى لە نازو بەرەکەتى بەهەشت بىَ بەش نابێت، یان هەرگیز بە سزاى دۆزەخ سزا نادرێت)).هەروەها دەفەرمویێت: ﴿أَفَغَيْرَ دِينِ اللَّهِ يَبْغُونَ وَلَهُ أَسْلَمَ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَإِلَيْهِ يُرْجَعُونَ * قُلْ آمَنَّا بِاللَّهِ وَمَا أُنْزِلَ عَلَيْنَا وَمَا أُنْزِلَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالْأَسْبَاطِ وَمَا أُوتِيَ مُوسَى وَعِيسَى وَالنَّبِيُّونَ مِنْ رَبِّهِمْ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِنْهُمْ وَنَحْنُ لَهُ

مُسْلِمُون *وَمَنْ يَبْتَغِ غَيْرَ الْإِسْلَامِ دِينًا فَلَنْ يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الْآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِين ﴾ سورةتى آل عمران ٨٣-٨٥).

واته: ئاخۆ دینێکتان دەوێت لە جێگەی دینی خوای گەورە؟ کە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە بیانەوێ و، نەیانەوێ موسوڵمان و ملکەچی فەرمانی ئەون و، هیچ کەسێك ناتوانێت لە ژێر دەسەڵاتی خوا خۆی لابدات، وە هەمووانیش تەنها هەر بۆلای ئەو دەگەڕێنەوە...، ئەی محمد (صلی الله علیه وسلم) تۆش بڵێ خۆم و گەلەکەم باوەڕمان هێناوە بەو قورئانە، بەو شتانەش کە بۆ ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقوب و نەوەکانی ئەو (یوسف و براکانی یوسف) هاتبوو، وە باوەڕیشمان بەو (تەورات) و (ئینجیل)ە کە بۆ موساو عیسا هاتووە و، وە بە تەواوی پێغەمبەرەکانی دیکە وەك (داود و سولەیمان ئەیوب) هەیە، وە لەبەرامبەر هیچ کەسێکیاندا جیاوازیمان نییە و، بڕوامان بە هەموویان هەیە، وە تەنها و تەنها گوێڕایەڵی ئەوین، وە هەرکەسێك جگە لە بەرنامەو شەریعەتی ئیسلام هەردین و بەرنامەیەکی دیکە بۆ خۆی هەڵبژێری و بیکاتە دین و بەرنامەی خۆی ئەوە هەرگیز لێی وەرناگیردرێت، وە لە دوارۆژدا لە ڕیزی بە خەسار چووەکانە )).

## باسی
## پوچەڵکردنەوە و وەڵام دانەوەی ئەو گومان و بەڵگە بەتاڵانەی کە دینی (ديموكراسى) پێ دەڕازێنرێتەوە

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرمویێت: ﴿ هُوَ الَّذِي أَنْزَلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ مِنْهُ آيَاتٌ مُحْكَمَاتٌ هُنَّ أُمُّ الْكِتَابِ وَأُخَرُ مُتَشَابِهَاتٌ فَأَمَّا الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ ابْتِغَاءَ الْفِتْنَةِ وَابْتِغَاءَ تَأْوِيلِهِ وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُ إِلَّا اللهُ وَالرَّاسِخُونَ فِي الْعِلْمِ يَقُولُونَ آمَنَّا بِهِ كُلٌّ مِنْ عِنْدِ رَبِّنَا وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّا أُولُو الْأَلْبَاب * رَبَّنَا لَا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا وَهَبْ لَنَا مِنْ لَدُنْكَ رَحْمَةً إِنَّكَ أَنْتَ الْوَهَّاب ﴾

سورةتى آل عمران ٧-٨).

خوای گەورە (سبحانه وتعالی) لەم ئایەتە پیرۆزانەدا بۆمان ڕوون دەکاتەوە کە خەڵکی لەگەڵ شەریعەتەکەیدا دوو جۆرن، یان خەڵکی بەرانبەر ئایەتەکانی قورئان دوو جۆرن:

١. **شوێن کەوتوانێکی خاوەن عیلم و تێگەیشتنێکی دامەزراو:** هەموو ئایەتەکانی قورئان وەردەگرن و ئیمان بە هەمووی دەهێنن، وە دەق و نەصە گشتی یەکان بە تایبەتەکانەوە دەبەستنەوە، وە ڕەهاکانیش بە کۆت کراوەکان، وە کورت کراوەکان بە ڕوونەکان، وە هەر شتێك کێشەی هەبوو لایان، یەکسەر دەیگێڕنەوە بۆ دایکی لە بنچینە و ئوصوله دامەزراو و ئاشکراکان، وە قاعیدە جێگیرو پتەوەکان، کە بەڵگە شەرعییەکان پشتگیری لەسەر دەکەن...

٢. **وە شوێن کەوتوانێکی سەر لێ شێواو و گوماناوی:** کە تەنها شوێن شتە چوون یەك و گوماناوی یەکان دەکەون، کە تەنها دەست بەوانەوە دەگرن و لە پێناو فیتنە و ئاشوبدا پێی دڵ خۆش دەبن، وە ڕووش وەردەگێڕن لە ئایەتە موحکەم و ئاشکرا و ڕەوان و دامەزراوەکان یان تەفسیر کراوەکان ...

وە ئا لێرەدا ... لە بابو باسی (دیموکراسی) و ئەنجومەنی نوێنەرانی شیرکی و هاو شێوەیاندا، خەڵکی ڕێچکەی گومرایی و گومان (الزيغ والضلال) دەگرن، وە شوێن هەندێك ڕووداو و بەسەرهات و گومان و شوبوهاتە کان دەکەون و تەنها ئەوانە وەردەگرن، بێ ئەوەی بیبەستنەوە یان بیگەڕێننەوە بۆ ئەصل و بنچینە ئاشکرا و کۆت کراوەکان یان تەفسیر کراوەکان، لە قاعیدەکانی دین و بنەما دامەزراو و جێگیر و داڕێژراوەکەی ... ئەویش تەنها لەبەر ئەوەی دەیانەوێت حەق بە باتڵ و ڕووناکی بە تاریکی بشارنەوە .

لەبەر ئەوە ... لێرەدا و لەم باسەدا بە خێرایی هەندێك لەو گومان و شوبوهاتە ناودارانە باس دەکەین، وە بە یارمەتی و پشتیوانی خوای گەورە بەرپەچیان دەدەینەوە و پوچەڵ یان دەکەینەوە و وەڵامیان دەدەینەوە ...

## گومانی یەكەم:

## ( عمل یوسف عند ملك مصر )

# كاری پێغەمبەر یوسف علیه السلام لای پاشا و گەورەی میصر

بزانە: ئەم شوبهە و گومانە، كۆمەڵێك لەو موفلیس و مایە پوچانە خۆیان پیا هەڵواسیوە، كە هیچ بەڵگەیەكی موحكەم و ئاشكرایان پێ نییە.[٢٦]

**زۆر بێ شەرمانە دەڵێن: ئەی یوسف (علیه سلام) پلە و مە نصەبی وەزیری وەرنەگرت، یان نەبووە وەزیر، لەلای مەلیكێكی كافر و بێ باوەر، كە حوكمی بەوە نەدەكرد كە خوای**

---

[٢٦] ) تێبینی:

هەركەس تۆزێك بە وردی تەماشای سورەتی (یوسف) بكات دەبینێ كە زۆربەی ئایەتەكانی ئەم سورەتە لەسەر یەكتاپەرستی و حاكمیەتی خوای گەورە دەدوێن، كەچی سبحان الله ئەو دڵ نەخۆشانە هەموو باس و مەبەستەكانی ئەم سورەتە موبارەكە و ئەم چیرۆكە گەورەیان پێچەوانە كردۆتەوە.

**گەورە ناردبووی ؟ کەواتە لەبەر ئەوە بەژداری کردن لەو حکومەتە کافر و بێ باوەڕانەدا دروستە، بەڵکو بەژداری و چوونە ناو (بەرلەمانەکان) و ئەنجومەنەکانی گەل و هاوشێوە شیان دروستە ...**

## ئێمەش بە تەوفیقی خوای گەورە پێیان دەڵێین:

**یەکەم:** پشت بەستن و بەڵگە هێنانەوە بەم گومانە لەسەر چوونە ناو (پەرلەمان)ەکانی تەشریعی، و پشت بەستن پێی بەڵگەیەکی فاسید و باتیڵە، چونکە ئەم (پەرلەمان)ە شیرکی یانە لە بنەڕەتدا لەسەر دینێك وەستاوە لە جێگەی دینی خوای گەورە، ئەویش دینی (دیموکراسی) یە، کە تێیدا خوایەتی (ئولوهیەتی) تەشریع و حەڵاڵ کردن و حەرام کردن بۆ گەلە نەك بۆ خوای تاك و تەنها .

وە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَنْ يَبْتَغِ غَيْرَ الْإِسْلَامِ دِينًا فَلَنْ يُقْبَلَ مِنْهُ﴾ واتە: هەرکەس شوێن دینێکی دیکە بکەوێت جگە دینی ئیسلام ئەوە لێی وەرناگیردرێت )).

باشە کەس هەیە زاتی ئەوە بکات یان بوێرێت و پێی وابێت یان بانگەوازی ئەوە بکات کە پێغەمبەر یوسف (عليه السلام) شوێن دینێکی تر کەوتووە لە جێگەی دینی ئیسلام، یان شوێن میللەت و ڕێبازێك کەوتووە لە جێگەی میللەت و ڕێبازی باوانی یەکتاپەرستی ... یان سوێنی خواردووە لەسەر ڕێزگرتنی؟؟ یان بە گوێرەی ئەو شەرعی داناوە ؟؟ وەك ئەوەی حاڵی ئەندام پەرلەمانەکانی ئەم زەمانەیە..؟؟[٢٧]

---

[٢٧] ) وەك لە دەستوورەکانیاندا هاتووە و نوسراوە کە (أن الامه أو الشعب هو مصدر السلگات) واتە گەل یان میللەت سەرچاوەی هەموو دەسەلاتەکانە، سەیری مادەی (٥) لە ڕەشنووسی دەستوری هەمیشەیی عێراق نوسراوە، هەروەها مادەی (٣) لە پڕۆژە دەستوری هەمیشەیی هەرێمی کوردستان، وە دەسەلاتی یاسا دانان بە مەلیك یان پاشا یان ئەنجومەنی گەل دەبەسترێت، سەیری مادەی (٦١) و (٧٣) لە ڕەشنوسی دەستوری هەمیشەیی عیراق بکە، لەگەڵ مادەکانی (٤٠) و (٥٣) و (٥٤) لە پرۆژەی ڕەشنوسی دەستوری هەمیشەیی کوردستان بکە ./ هەروەها ئەمەش هاوتایە لەگەڵ دەستوری وڵاتەکانی دیکەی وەك کوێت و ئوردون و غەیری ئەوانیش ....

چۆن شتى وا دەبێت، لەكاتێكدا يوسف (عليه السلام) كە بێ دەسەلاتە و لە زيندانە و دەست بەسەرە، بە ئاشكرا بانگەواز دەكات و دەفەرموێت: ﴿إِنِّي تَرَكْتُ مِلَّةَ قَوْمٍ لَا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَهُمْ بِالْآخِرَةِ هُمْ كَافِرُون * وَاتَّبَعْتُ مِلَّةَ آبَائِي إِبْرَاهِيمَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ مَا كَانَ لَنَا أَنْ نُشْرِكَ بِاللَّهِ مِنْ شَيْءٍ﴾ سورةتى يوسف ٣٧ — ٣٨).

واتە: چاك بزانن كە من ڕێبازى (ميلەتى) ئەو كەسانەم واز لێهێناوە، كە باوەڕيان بە خوا و ڕۆژى دوايى نييە، وە بۆخۆم كەوتومەتە شوێن ڕێبازى باب و باپيرانم: ئيبراهيم و ئيسحاق و يەعقوب، هەركەسێكى ديكەش ئاوا بكات، هەر ئاوا سەركەوتو دەبێت، وە بۆ ئێمەش نييە (خانەوادەى پێغەمبەران و شوێن كەوتوانيان) هيچ شتێك بكەينە هاوبەش و هاوەڵى خواى گەورە )).

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ يَا صَاحِبَيِ السِّجْنِ أَأَرْبَابٌ مُتَفَرِّقُونَ خَيْرٌ أَمِ اللَّهُ الْوَاحِدُ الْقَهَّار * مَا تَعْبُدُونَ مِنْ دُونِهِ إِلَّا أَسْمَاءً سَمَّيْتُمُوهَا أَنْتُمْ وَآبَاؤُكُمْ مَا أَنْزَلَ اللَّهُ بِهَا مِنْ سُلْطَانٍ إِنِ الْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ أَمَرَ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا إِيَّاهُ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُون ﴾ سورةتى يوسف ٣٩-٤٠)

واتە: ئەى هەردوو هاوڕێى بەنديخانەكەم: ئاخۆ چەند خوايەكى جيا جيا (موتەفەريق) بپەرسترێن چاكترە، يان هەر يەك خواى تاك و تەنها و زاڵ و بە دەسەلآت بەسەر هەموو شتێكدا ؟؟ ئەوەش چاك بزانن ئەوانەى ئێوە لە جێگەى خوا دەيان پەرستن تەنها چەند ناوێكى بێ ناوەڕۆكن، ئێوە و باب و باپيرانتان بە ئارەزووى خۆتان ناوتان ناون و كردوتانن بە خوا/ وە خواى گەورە هيچ بەلگەيەكى بۆ ڕاستى پەرستنى ئەوانە نەناردووە، وە هەموو حوكم و بريارێك تەنها و تەنها هەر هى خوايە، وە دەبێت تەنها هەر ئەو حاكم و بڕيار بەدەست بێت، وە فەرمانى داوە كە: ئێوە دەبێت تەنها بەندايەتى بۆ ئەو بكەن و ئەو بپەرستن و گوێڕايەڵى ئەو بكەن، نەك لە حيزب و عەشيرەت و گروپ و خێڵ ....، هەر ئەو ئاينە (يەكتاپەرستى) ڕاست و ڕەواو پايە دارە، كە پێم ڕاگەياندى و بانگەوازم بۆ كردى، بەلآم زۆربەى خەڵكى نازانن كە ئايينى يەكتاپەرستى (تەوحيد) ڕاست و ڕەوا يە )).

جا يانى ئايا يوسف (عليه السلام) له كاتى بىَ دەسەلاَتى و دەست بەسەرى و لاوازيدا بانگەوازى بۆ دەكات و ڕايدەگەيەنێت ... پاشان دواى دەسەلاَت و بە هێز بوون دەيشارێتەوە و لێى پەشيمان دەبێتەوە!!؟؟

وەلاَم مان بدەنەوە ئەى ئەوانەى خۆتان بە حەكيم و ژير ئەزانن، ئەى ئەوانەى فەلسەفە سوتاندونى...!

پاشان ئێوە ئەى دەهاقينەكانى سياسەت، سياسەت مەدارەكان نازانن كە وەزارەتەكان دەسەلاَت و سولَتەى جێبەجىَ كردن (تەنفيزى) يە و، پەرلەمانيش دەسەلاَتى شەرع دانان (تەشريع)ى يە ؟

وە لە نێوان ئەمە و ئەوەدا، واتە دەسەلاَتى جێبەجێكردن و شەرع دانان چەندەها جياوازى و فەرق هەيە، هەر بۆيە لێرەدا ئەو پێوەر (قياس) كردنەى كە بانگەوازى بۆ دەكەن ڕاست نييە و هەلَەيە ...[28]

---

[28] ) هەندێك پێيان وايە و بانگەوازى ئەوە دەكەن كە وەزارەتەكان زۆر مەترسى دارترە لە پەرلەمانەكان، بەمەش پێيان وايە دەتوانن پەرلەمان بكەنە سەنگەر و بەرەيەكى خەبات و جيهاد دژى حكومەت، كە لەم بەرەدا جيهاد دەكەن جيهادێكى دەستوريانە!، وە خەبات دەكەن تێيدا خەباتێكى ياسايى يانە، وە تێدەكۆشن تێيدا تێكۆشانێكى ديبلۆماسى و ئاشتى يانە، وە كوێراييان داهاتووە و نابينن كە شەرع دانان (تەشريع) زۆر خراپتر و مەترسى دارترە لە جێبەجىَ كردن (تەنفيز)، وە بەتايبەتيش ئەو تەشريعەى كە پێى دەلَێن جيهاد و تێكۆشان و خەبات كردن لە پێناويدا، هيچ كاتێك لە پەرلەماندا ناكرێت هەتا موتابيق و هاوتا نەبێت لەگەلَ مادەكانى دەستوور و دينى ديموكراسى، وە هەتا بۆئەوەى بەباشى تێبگەى سەيرى ڕەشنوسى دەستورى هەميشەيى عێراق بكە مادەى (٦): (ئەنجومەنى نوێنەران ئەم ئەركانەى خوارەوەى لە ئەستۆدايە: ١- دانانى ياسا فيد ڕالَييەكان) وە هەروەها مادەى (٧٣) لە ڕەشنوسى هەميشەيى عێراق : (سەرۆك كۆمار ئەم دەسەلاَتانەى خوارەوەى هەيە: .... سێهەم: پەسەند كردن و دەر كردنى ئەو ياسايانەى ئەنجومەنى نوێنەران دايدەنێن، ياساكانيش بە پەسەند كراو دادەنرێن پاش تێپەڕ بوونى (١٥) ڕۆژ بەسەر ناردنيان بۆ سەرۆك كۆمار)، وە مادەى (٤٠) لە پڕۆژە دەستورى هەرێمى كوردستانى عێراق: (پەرلەمانى كوردستان دەسلاَتى تەشريع و ياسا دانان و سەرچاوەى بڕيار دانە لەسەر پرسە چارە نووس سازەكانى گەلى هەرێمى كوردستان )، وە مادەى (٥٣) لە پڕۆژە دەستورى هەرێمى كوردستان : (پەرلەمان بێجگە لەو ئەركەى بە پێى ياسا كارپێكراوەكانى هەرێم پێى دەسپێردرێن، ئەم ئەركانەشى لەسەر شانە، ١- دانانى تەشريع و ياسا لە هەرێمى كوردستان )، وە هەروەها مادەى (٥٤) لە پڕۆژە ڕەشنوسى دەستورى هەرێمى كوردستانى عێراق: جگە لە

وه لەمەوە دەزانى كە بەڵگە هێنانەوە و پشت بەستن بە چیرۆكی یوسف (علیه السلام) لەسەر ڕێپێدان و شەرعاندنی پەرلەمانەكان قیاسێكی فاسیدە و بەهیچ جۆرێك دروست نییە، وە هیچ ڕێگرییەكیش مان نییە لە بەتاڵ كردنەوەی بەڵگە هێنانەوە لە چونە ناو وەزارەتەكان و بەژداری كردن تیایاندا، لەبەر هاوبەشی هەردوو پۆستەكە (جێبەجێ كردن و تەشریعی) لە كوفردا ...

**دووەم:** پاشان قیاس كردنی زۆرێك لە گومڕاو سەر لێ شێواوەكانی وەزارەتەكان، كە لە ژێر سێبەری حوكام و كار بەدەستە طاغوتی یە كانن، و تەشریع لەگەڵ خوای گەورەدا دائەنێن و موحارەبە و دژایەتی شوێن كەوتوانی دینی خوای گەورە و ئەولیائەكانی دەكەن و، دۆستایەتی دوژمنەكانی خوای گەورە دەكەن، لەسەر كار و پیشەی یوسف (علیه السلام) قیاسێكی فاسید و باتڵ و بەتاڵە، لە چەند ڕوویەكەوە :

١- ئەو كەسانەی دەبنە وەزیر و كاربەدەست لە ژێر سێبەر و سایەی ئەم حوكام و حوكمەتانـەی كە حوكم بە غەیری حوكمی خوای گەورە دەكـەن، هـیچ چـاری نییـە و ناچـارە و دەبێـت ئـیلا گوێڕایەڵی و ڕێـزی دەسـتووره دانـراوە وەزعـی یەكـەیان بگرێـت، و وەلائـو ملكەچـی و دڵسۆزی هـەبێت بـۆ طاغوت، كـە خـوای گـەورە یەكـەم شـت فـەرمانی داوە كـە پێـی كـافر ببێـت و لێـی دەربچێت و دژایەتی و دوژمنایەتی بكات، خوای گەورەش دەفـەرموێت: ﴿ يُرِيـدونَ أن يَتَحـاكَموا إلى الطـاغوت وَقَـد أُمِـروا أن يَكفُـروا بِـهِ ﴾ ٦٠). واتــە: مونافیقـەكان بـۆ بریـنـەوە و داد وەری كێشەكانیان دەیانەوێت بچن بۆلای (طاغوت) و بەرنامەی غـەیری بەرنامـەی خـوای گـەورە، لـە كاتێكدا فەرمانیان پێ كراوە كە بەو بەرنامانە كافر ببن و لێی دەربچن )).[29]

---

حوكمی برگەی (حەوتەم)ی مادەی (٦٥)،كە لەم دەستوورەدا هاتووە، پەرلەمان بـۆی نییـە واز لـە دەسـەلاتەكانی یاسا دانانی خۆی بهێنێت ).

[29] ) تێبینی یەكی گرنگ :

هۆكاری دابەزینی ئایەتەكە:

ئیمـامی (ئەحمـەد) و (حـاكم) و (بەیهـەقی) و (طـەبـەری) و (ئـیبن كـەثیر) و غـەیری ئـەوانیش بـە سەنەدێكی صەحیح ڕیوایەتیان كردووە بە تەحقیقی زانای فەرموودە ناس احمد شاكر و شێخ ئـەلبانی، كە (( جارێكیـان پیـاوێكی جولەكـە و بـەناو موسـوڵمانێك (مونافیق)ێـك كێشـەیەك كەوتـە نێوانیـان، جـا بـۆ

بەڵكو جگە ئەمانەش بە مەرج و ناچاری دەبێت سوێندیان بۆ بخۆیت لەسەر ئەم كوفرە، پـێش ئـەوەی پلـەی وەزیـری وەربگریـت ڕاسـتەوخۆ بـە تـەواوەتی، ئەمـەش تـەواو وەك ئەنـدام پەرلەمانەكان... [30]، پاش ئەمە هەركەس پێی وابێت یوسفی راستگۆی كوری ڕاسـتگۆی بـەڕێزی

---

چارەسەر كردنی كێشەكە، كابرای جولەكە وتی: بابچینە لای محمد هەتا حوكم و داد وەریمان بكات، كـابرای بـەناو موسـوڵمانیش (مونـافیق) وتـی نـەخێر بـا بچینە لای (كـەعبی كـوری ئەشـرەف)ی جولەكـە، پاشان جولەكەكە وتی: من دەڵێم با بچینە لای پێغەمبەرەكەتان، كەچی تۆ بۆلای كەعبی بەرتیل خۆرم دەبەیت؟!، ئیتر كابرای بەناو موسوڵمان (مونافیق) بە ناچاری لەگەڵیدا چوو بۆلای پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم)، وە پاش بـاس كردنـی كێشـەكەیان، بـەقازانجی كـابرای جولەكـە تـەواو بـوو، پاشـان كـابرای بـەناو موسـوڵمان (مونافیق) وتی من بەم حوكم و بڕیارە رازی نـیم و قایـل نـابم، دەبـێ بچـین بـۆلای ئیمـامی عومـەر (رەزای خـوای لـێ بێـت)، كـابرای یـەهودیش شـوێنی كـەوت و رازی بـوو/ ئـەوەبوو چـون بـۆلای ئیمـامی عومـەر و كێشەكەیان بۆ باس كرد، وە كابرای یەهودی خێرا پێی ووت: ئەی عومەر بزانە پێش تۆ ئێمە چووین بۆلای ئەبا قاسم (محمد) و، بڕیاری بۆ مندا و مافەكەی گەڕاندەوە بۆ من، كەچی ئێستا ئەم بەناو موسوڵمانە قایل و رازی نابێت بـە حـوكمی محمـد و، هێناومـە بـۆلای تـۆ، هـەتا تـۆ حـوكم مـان بكـەیت/ ئیمـامی عومـەریش فـەرمووی: جـا چـۆن شـتی وا دەبێـت؟! ، كـابرای بـەناو موسـوڵمان (مونـافیق) وتـی: بـەڵێ/ ئیمـامی عومـەر فەرمووی: كەوایە كەمێك چاوەروان بن، ئێستا حوكم تان ئەكەم، ئیمامی عومەر بەپەلە هەڵسا و گەڕایـەوە بۆماڵەوە و شمشێرەكەی هێناو، یەكسەر بەبێ قسە كردن دای لە ملی كابرای بەناو موسوڵمان (مونافیق) و سەری پەڕان، و فەرمووی: (( **ومن لم يرضى بحكم الله و رسوله فهذا حُكمُهُ** )) واتە: هەركەس رازی نـەبێت بە حوكمی خوا و پێغەمبەرەكەی ئەوە حوكمی ئـەبێت، یـان ئـاوا ئـەدەم لـە ملـی ))، ئـیتر ئـەوە بـوو خـوای گەورە ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُوا بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنْزِلَ مِنْ قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَنْ يَتَحَاكَمُوا إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوا أَنْ يَكْفُرُوا بِهِ وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَنْ يُضِلَّهُمْ ضَلَالًا بَعِيدًا﴾. بـۆ زیـاتر سـەیری تەفسیری طەبەری و ئیبن كەثیر و ارشاد الرحمن و ابن عەباس بكە ...

[30] ) وەك ئەمە لە مادە دەستوورییەكانی زۆربەی وڵاتانی دونیادا هاتووە، كە پێویستە سـەرۆك یـان وەزیـران یـان وەزیرەكـان، یـان ئەنـدامی پەرلەمانـەكان، پـێش ئـەوەی دەسـت بكـەن بـە كارەكانیـان و مەنصـەب و پلـەكانیان بدرێتێ، سوێنێكی گەورە لە بەردەم سەرۆك و مەلیك و گەورەكانیان بخۆن و بڵێن: (( اقسم بـالله العظـيم، أن أكـون مخلصا لـل ملـك (أو للـرئيس أو للـوطن) وأن احـافظ علـى الدسـتور)).لە مـادەی (٥٠) لـە رەشنوسـی دەسـتوری هەمیشەیی عێراقدا هاتووە: (( ئەندامی ئەنجومەنی نوێنـەران سـوێندی دەسـتوری دەخـوات لـە بـەردەم ئەنجومەنـدا پێش دەست بەكار بوون، بـەم شـێوەیەی خـوارەوە: سـوێند بێـت بـە خـوای گـەورە و مـەزن، ئـەرك و بەرپرسـیارێتی یاسـاییم بـە لێبڕاوانـە و دڵسـۆزانە جێبـەجێ بكـەم، و پارێزگـاری لـە سـەربەخۆیی و سـەروەری عێـراق بكـەم، و بەرژەوەندی گەلەكەی لەبەر چاو بگرم، و شەونوخونی بكەم بـۆ سـەلامەتی ئاسمان و زەوی و ئـاو و سامان و ڕژێمـە

کوری ڕاستگۆی بەڕێز، ئاوا بووە و بەم جۆرەی کردووە، لەگەڵ ئەوەشدا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ ذَلِكَ لِنَصْرِفَ عَنْهُ السُّوءَ وَالْفَحْشَاءَ إِنَّهُ مِنْ عِبَادِنَا الْمُخْلَصِينَ ﴾ يوسف٢٤). واتە: ئێمە یوسفمان پاراست لە کاری خراپە و فەحشائو داوێن پیسی، ئەویش بە هۆی ئەو ئیمانە دامەزراوەیەوە کە هەی بوو، بۆ ئەوەی لە ئایندەشدا لە هەموو کارێکی خراپ و مونکەر لای بدەین و بیپارێزین، چونکە یوسف بەندەیەك بوو لە بەندە هەڵبژێر دراوەکانی خۆمان )). ئا ئەوە بێ باوەڕ ترین و کافر ترین و گەنترین بوونەوەرە، وە دەرچووە و هەڵگەڕاوەتەوە لە ڕێباز و میلەتی ئیسلام، بەڵکو زۆر لە (ئیبلیس) پیس ترو خراپتر و شەڕەنگێز ترە، کاتێك سوێندی خوارد و بێجگەی کرد: ﴿فَبِعِزَّتِكَ لَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ۞ إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ الْمُخْلَصِينَ﴾. واتە:

---

دیموکراسی و فیدراڵییەکەی، و کار بکەم بۆ پارێزگاری لە ئازای یە گشتی و تایبەتیەکان و سەربەخۆیی دادگاو پابەند بوون بە جێبەجێ کردنی یاساکان، بە ئەمانەت و بێلایەنی یەوە، خواش شایەتی ئەوەیە کە دەیڵێم )).

وە مادەی (٤٤) لە پرۆژە دەستوری هەرێمی کوردستانی عێراقدا هاتووە: (( ئەندامی پەرلەمان پێش دەست بەکار بوونی، ئەم سوێندە دەستوری یە دەخوات: بە خوای گەورە سوێند دەخۆم، کە بەرژەوەندی گەلی هەرێمی کوردستان و یەکێتی و کەرامەت و ماف و ئازادییەکانی هاوڵاتیان و سامانی گشتی بپارێزم و، پابەندی حوکمەکانی دەستوور ببم، و ئەرکی ئەندامێتی بە راستی و دڵسۆزی یەوە ئەنجام بدەم )).

وە هەروەها لە هاوشێوەی ئەمەدا لە مادەی (٧٩) دا هاتووە: لەسەر هەر ئەندامێك لە ئەندامەکانی هەردوو ئەنجومەنی پیاو ماقوڵان و نوێنەران پێش دەست کردن بە کارەکانیان لە پێش ئەنجومەنەکەی سوێندێك بخوات کە ئەمە دەقەکەیەتی: سوێند بە خوای گەورە دەخۆم، کە دڵسۆز بم بۆ پاشاو نیشتمان، وە پارێزگاری لە دەستوور بکەم .. تا دوایی).

**جا توخوا پێغەمبەر یوسف (علیه السلام) هەستاوە بە کاری وا ؟؟**

وە نەکەی هەڵبخەڵەتێی و فریو بدرێیت و تێبکەویت بە فرتو فێڵ و تەلبیساتی هەندێك لە بە فیتنە چووەکان، کە دەڵێن و دەفلتێنن: سوێند دەخۆین لەسەر پارێزگاری دەستوور، و پاشان لە دڵی خۆماندا بە جیاواز دەڵێین: ( لە سنوری شەرعدا)، ئەوە بابزانن خۆیان و خەڵکی هەڵدەخەڵەتێنن، وە پێیان دەڵێین یاسای سوێند لە شەریعەتی ئیسلامدا بەو جۆرە نییە، بەڵکو بەم جۆرەیە : (( **ليس اليمين على نية الحالف** )) واتە سوێند لەسەر نییەتی سوێند خۆر نییە، واتە لەسەر نییەت و ئیرادەی خۆی قبوڵ نییە، ئەگەر بەوشێوەی جەنابتان بێت، کە بانگەشەی بۆ دەکەن، ئەوە تەواوی گرێبەست و مەرج و هەموو سوێندەکانی خەڵکی فاسید دەبێت و دەرگای درۆ و گاڵتە بازی بەڕووی هەموو گاڵتە باز و ساختەچی یەکاندا دەکرێتەوە، بەڵام وەك پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە صەحیحی موسلیمدا دەفەرموێت: (( **اَليَمِين على نِيَّة المُستحلِف** )). واتە: سوێند لەسەر نییەتی سوێند دەرەکەیە، یان سوێند دەرەکەیە، نەك سوێند خۆرەکە )). واتە لەسەر نییەتی ئەو کەسەیە کە کەسەکەی دیکە سوێند دەدات، نەك خاوەن سوێندەکە ... بۆیە ئەو سوێندانەتان لەسەر نییەتی ئێوە نییە، بەڵکو لەسەر نییەت و ئیرادەی ئەو طاغوتەیە کە سوێندتان ئەدات، یان سوێندی داون .

شەيتان سوێندی خوارد بە عیزەتی خوای گەورە و وتی: سوێند بێت بە عیزەتت، ئەبێت هەموو بەندەکانت گومرا بکەم و لە دین لایان بدەم، تەنها ئەوانەیان نەبێت کە بەندەی پاك و هەڵبژاردەی تۆن، یان ئەوانە نەبێت کە من دەسەلاتم نییە بەسەر یاندا و ئەولیائی خۆتن)).ص٨٢-٨٣).

بە نەص و دەقی ئایەتی قورئان، یوسف (علیه السلام) لە بەندە هەڵبژێردراوەکانی خوای گەورەیە، بەڵکو لە سادە و تایبەت ترینیانە، ئەوەتا خوای گەورە لە سەروی حەوت ئاسمانەوە شایەتی بۆ دەدات!!

٢- ئەوانەی دەبنە وەزیر لە ژێر سێبەری راحەتی ئەو حوکمەتانەدا ، ئەگەر سوێندی یاسایی و دەستوری بخۆن یان نەی خۆن، بێ گومان دەبێت ئیلا بێ ئەمسەراو سەر، هەر پشتگیری و گوێڕایەڵی یاسا و قانونە کوفری و بێ باوەڕی یە دارێژراوەکەیان بکات و لانەدات و پێچەوانەی نەبێت و لێی دەرنەچێت، چونکە ئەو هیچ نییە، تەنها ئەوە نەبێت کە بەندەیەکی دڵسۆزە بۆی و، خزمەت کارێکی گوێڕایەڵە بۆ دانەرەکانی، لە هەق و ناهەق و باتڵ و فسق و ستەم و زوڵم و کوفر و بێ باوەڕی.

جا ئایا یوسفی ڕاستگۆ (صدیق) بەم جۆرە بوو، شتی وای کردووە؟؟، هەتا کاری ئەو بگونجێت بۆ بەڵگە هێنانەوە لەسەر دروستی و وەرگرتنی پۆست و پلەی گەلی کوفر و بێ باوەڕی ؟؟ ، جا **هەرکەس** شتێك لەم تۆمەت و شوبهەو قسە بەتاڵانە بداتە پاڵ کوری پێغەمبەری خوای کوری پێغەمبەری خوای کوری پێغەمبەری خوای کوری خۆشەویستی خوا، ئەوە هیچ گومان و شەکما نییە لە کوفری و بێ باوەڕی و زەندیقی و دەرچوونی لە ئیسلام و مورتەد بوونەوەی ئەو کەسە، جا هەرکەس هەیە با ببێت ..

چونکە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغوت﴾ النحل ٣٦) واتە ئێمە بۆ هەموو گەل و نەتەوەیەك (قەومێك) پێغەمبەرێکمان ڕەوانە کردووە، هەتا بەندایەتی خوای گەورە بکەن و واز لە بەندایەتی و گوێڕایەڵی (طاغوت) بهێنن)).

چونكه ئەمه ئەصل و بنچینەی بنچینەكان و گەورەترین بەرژەوەنـدی و مەصلەحەته له بووندا لای پێغەمبەر یوسف (علیه السلام)، و تەواوی پێغەمبەر و نێردراوەكانی دیكه ...

جا ئایا دەچێته عەقڵەوە، كه له خۆشی و ناخۆشی و كاتی لاوازی و بەهێزیدا، بانگەوازی خەڵكی بۆ بكات، پاشان هەر خۆی لێی پەشیمان بێتەوە و هەڵی بوەشێنێتەوە و بچێته ڕیـز و سەرانی موشریكانەوە؟؟ چۆن شتی وادەبێت، لەگەڵ ئەوەی خوای گەورە بـه بەنـده پـاك و هەڵبژێر دراوەكانی خۆی وەسفی كردووە ...

هەندێك له زانایانی تەفسیر، له تەفسیری ئایـەتی: ﴿مَا كَانَ لِيَأْخُذَ أَخَاهُ فِي دِينِ الْمَلِكِ﴾ سورةتی یوسف ٧٦). واتە: له بەرنامه و دەستوری پاشای (میصـر)دا نـەبوو، یوسـف (علیـه السلام) براكەی خۆی بگرێ و گلی بداتەوە لای خۆی و بیكاتـه كۆیلـه، لـه بـاتی دزییەكه، بـەڵكو تـەنها ئەوەندەی بـۆ هـەبوو كـه برێكـی لێبـدا و دوو قـاتی شـته دزراوەكـەش پێـی بـژێرێت، بـەڵام لـه شەریعەتی بابیدا، ئەو حوكمه هەبوو، واته دز بكرێته كۆیله، بۆیه كـردی و لەسـەر شـەریعەتی بابی حوكمی دا بەسەر (بنیامین)ی برایدا)).[٣١]

---

[٣١]) سەیری تەفسیری ئیبن عەباس و ئیبن كەثیر و طەبەری و غەیری ئەوانیش بكه .

ئەصلی چیرۆكەكه بەم جۆره بوو:

پاش ئەوەی پاشای میصر، خەونێكی بینی و كەس نەبوو بۆی ڕاڤه بكات، بەڵام پێغەمبەر یوسف (علیـه السلام) خـوای گـەورە كەسـێكی لـه زینـدان (سـجن)دا بـۆ كـردە هۆكـاری ناسـاندنی بـه پاشـای (میصـر) و خەوەكەی به فەرمانی خوا بۆ ڕاڤه كرد، پاشای (میصر)یش لەسەر ئەو زانست و عیلمـه كـه بـه گێڕانـەوەی خەو هەیبوو، كردی یه دەسەڵاتدار، ئەوەش بـه نەصـی ئایـەت هـەر بـه فـەرمانی خـوای گـەورە بـوو، كرایـه دەسەڵاتدار، پاشان زۆری نەبرد قات و قڕی گرانی له وڵاتی (كەنعان) سەری هەڵدا، وە براكانی (یوسـف) كـه له (كەنعان) دەژیان و ئـەصل و خاكی یوسف بوو، به فەرمانی پێغەمبەر (یەعقوب)ی بابیـان (علیـه السلام) پەنایان بردە بەر (میصر) و هاتن لەوێ زەخیرە و خواردن و ئازوقه بكرن، كاتێك كه چوونه ژوورەوە بۆلای (یوسف) ئەم ئەوانی ناسییەوە، بەڵام ئەوان (یوسف)یان نەناسییەوە،چونكه ئەوان هەر له منـداڵی یوسـفەوە نەیان بینیبوو، پاش ئەوەی پێغەمبەر یوسف به دەستی خۆی بارە خۆراك و ئازوقەكەی بۆ ڕێك خسـتن، لـه دوای برێكی زۆر پرسیار و وەڵام لێیان ووتی: برایەكی باوكی تان هەیـه دەبێـت ئـەم جارە هاتنـەوە بیهێـنن بۆم، چونكه بۆیان بـاس كـرد كـه برایـەكی تریـان هەیـه لای باوكیانـه لـه خـاكی كـەنعان، وە فـەرمووی: جا ئەگەر ئەم جارە هاتنەوە بۆلام و ئەوتان بۆ نەهێنام هیچ شتێك تان نادەمێ، وە بـێ ئـەو مەیەنـەوە، پاشان

ئەم چیرۆکە قورئانی یە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی، کە پێغەمبەر (یوسف) قانون و یاسای پاشای (میصر)ی جێبەجێ نەکردووە، بەڵکو هیچ حساب و ئیعتبارێکیشی بۆ دانەناوە، بەڵکو لەسەر ئایینی باب و باپیرانی بووە و هەر بە شەریعەتی ئەوان کاری کردووە ...

ئایا لە وەزارەت و پەرلەمانەکانی طاغوتەکانی ئەم ڕۆژگارەدا شتی لەم جۆرە هەیە، شتی وا جێی دەبێتەوە !!؟؟ بارودۆخی وەك وەزیر تیایدا وەك ئەوە بێت هەروەك دەڵێن: (دەولەتێك لەناو دەولەتێك)، ئەگەر شتی وا بوونی نەبێت دە کەواتە ئەم قیاسە بە هیچ جۆرێك لێرەدا جێی نابێتەوە .

٣- پێغەمبەر یوسف (علیه السلام) هەموو ئەو وەزارەتەی کە پێی بەخشرابوو، بە دەسەڵات و فەرمان و تەمکینی خوای گەورە بوو، چونکە خوای گەورە لە هەردوو ئایەتی (٢١و ٥٦)ی سورەتی (یوسف) دا دەفەرموێت: ﴿ وَكَذَٰلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي الْأَرْضِ ﴾. واتە: ئێمە لە خاکی (میصر) دا پلە و پایە و دەسەڵاتمان بە یوسف دا)). هەندێك لە موفەسرین دەفەرموون: مَكّنا:أي مَلّكنا/ ئەوە دەسەڵات و پایەیەك بوو لای خوای گەورەوە پاش (٧) ساڵ ئەزیەت و تەعزیب و سجن ، وە بۆ پاشا و جگە ئەویش نییە کە زەرەری پێ بگەیەنن، یان دووری

---

براکانی گەڕانەوە بۆلای باوکیان و بۆیان باس کرد، پاش قسە و جیدالێکی زۆر، (یەعقوب)ی باوکیان ڕازی بوو کە (بنیامین) بنێرێت لەگەڵ یان بۆ لای (یوسف)، واتە بۆ (میصر)، بەلام (یوسف) ویستی بە ژیرانە خۆ بەوان بناسێنێ، بۆیە بۆ جاری دووهەم کە (بنیامین) یان بۆ هێنا، بردی یە لای خۆیی و هەموو شتەکانی تێگەیاند، وە پێشی ووت کە بەتەمایە لە ڕێگای شتێکەوە گلی بداتەوە، بۆیە کاتێك کە خواردن و ئازوقەی بۆ ئامادە دەکردن، (عەیار)ی پاشاکەی خستە ناو بارەکەی (بنیامین)ەوە، کە ڕۆشتن بە جارڕەرێکی ووت: جارڕبدات و پێیان بڵێت: ئێوە دزیتان کردووە، ئەوانیش سوێندیان خوارد کە نەیان دزیوە، بەلام یوسف ووتی : (عەیار) پێوانەکە لە باری هەرکەسێکتان بوو، هەر ئەوکەسە بۆخۆی تۆڵەی ئەو (عەیار)ە بێت، واتە دەکرێتە کۆیلە، چونکە لە شەریعەتی بابیدا (یەعقوب)، هەرکەس دزی بکردایە لە جێگای دەست برین دەکرایە کۆیلە، بەلام لە دەستوری ئەو کاتەی پاشای (میصر) دا، دەبوایە برێکی باشیان لێ بدایە و ئەو شتەشیان دوو بەرامبەر پێ بژاردایە، بەلام یوسف دەسەڵات و سوڵتەی تەواوەتی (مطلق)ی هەبوو، ئەم کارەی نەکرد، بەڵکو بە پێی ئایینی بابی (یەعقوب) بنیامینی کردە کۆیلە .. بۆ زیاتر سەیری تەفسیری سورەتی (یوسف) بکەرەوە ...

بخەنەوە لە مەنصەب و پۆستەکەی، هەتا ئەگەر پێچەوانەی پاشا و حوکم و سوڵتەکەشی بکات ...

جا بۆ ئەو بێ شەرم و بێ ئابڕوانە، کە ئەمڕۆ بوونەتە وەزیر و ئەندام پەرلەمان لە ژێر سێبەر و سایەی (طاغوت)ەکان، دە توانن لەو مەنصەب و پۆستە ڕسوایی و زەلاڵەتەیاندا دەسەلاتی بەو جۆرەیان هەبێت، کە لەراستیدا یاری و گاڵتە بازی و مەسخەرەیەکە بەدەست طاغوتەوە، هەتا قیاس بکرێت بە دەسەلاَت و ویلایەت و گرتنە ئەستۆی پێغەمبەر یوسف (عليه السلام)، لەگەڵ ئەو هێز و دەسەلاَتەی کە هەیبوو ؟؟

٤- پاشان پێغەمبەر یوسف (عليه السلام) دەسەلاَت و (حەصانە)ی تەواوەتی (مطلق)ی وەزارەتەکەی لە پاشاوە وەرگرت و پێدرا، چونکە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَلَمَّا كَلَّمَهُ قَالَ إِنَّكَ الْيَوْمَ لَدَيْنَا مَكِينٌ أَمِينٌ ﴾. یوسف٥٤). واتە: کاتێك یوسف هاتە لای پاشا (مەلیك) و دواندی و وتو وێژی لەگەڵ کرد، پاشا پێی ووت: بەڕاستی لەم ڕۆوە لای ئێمە پیاوێکی ئەمین و خاوەن دەسەلاَت و پلە و پایەیت)). ئیتر هەموو دەسەلاَت و ئازادی تەواوەتی (مطلق)ی پێدرا، بەبێ کەم و کورتی لە وەزارەتەکەیدا، بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَكَذَلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي الْأَرْضِ يَتَبَوأ مِنها حَيثُ يَشاء ﴾. واتە: ئێمە لە خاکی (میصر) دا پلە و پایە و دەسەلاَتمان بە یوسف دا، و لە هەر جێگایەك خۆی بیەوێت دادەنیشێت)).

ئیتر هەرچی بکات هیچ موراقەبە کار و چاودێرێك نییە بەسەر هیچ هەڵسو کەوت و کار و کردەوەیەکی یەوە، جا هەرچییەك بێت، جا ئایا لەم ڕۆژگارەدا شتی لەم جۆرە لە وەزارەتەکانی حوکامە (طاغوت)تی یەکاندا هەیە، یان تەنها دەسەلاَت و حەصانەی بەتاڵ و درۆ و دەلەسەیە ... ئەگەر وەزیر یاری و گەمەیەکی بە کلکی خۆی کرد یان ئەگەر شتێکی لێ دەرکەوت لە پێچەوانە و موخالەفە کردن و دەرچوونی لە فەرمانی سەرۆك و گەورە یان دینی پاشا و مەلیك، خێرا لادەبرێت، دوایش لەبەر حەیا نەچوونی لەناو خەڵکی دەڵێت لەبەر قبوڵ نەکردنی گەندەڵی دەستم لە پۆستەکەم کێشایەوە !!، لای ئەوان وەزیر چییە؟؟ لە خزمەت کار و خادیمێکی سیاسەتەکانی پاشا و سەرۆك، چۆن بیەوێت بە ئارەزووی خۆی فەرمانی پێدەکات و ڕێگری لێ دەکات و لای دەبات، و دەیهێنێ و دەیبا، وە حەق و مافی ئەوەشی نییە

پێچەوانەی یەك فەرمانی سەرۆك یان پاشا یان دەستووره دانراوەكە بكات، خۆ ئەگەر پێچەوانە و دژی خوای گەوره و شەریعەت و دینەكەشی بێت .

خۆ هەركەس (بە ئەندازەی مسقالی دەنكە گەنمێك) گومان بەرێت یان پێی وابێت و شتێك لەمانە بچوێنێت و بشوبهێنێت بە دەسەلات و حال و كاری گرتنە ئەستۆكەی پێغەمبەر یوسفەوە (علیە السلام)، واتە ئەو وەزیری یە كوفری و بێ باوەڕی یە جوانەی خۆی بشوبهێنێت بە یوسفەوە، ئەوە قێزەون ترین و گەورەترین بوهتانی كردووه، وە كافر و بێ باوەڕ بووه بە خوای گەوره، وە پاكانەی خوای گەورەی بۆ یوسف بەدرۆ خستۆتەوە ...

ئەگەر زانرا كە وەزیرایەتی و دەسەلات و حالی یوسف (علیە السلام) لە وەزارەتەكانی ئەم ڕۆژگارەدا بوونی نییە، ئەوە ئیتر هیچ مەجالێك نییە بۆ قیاس كردن و چواندنی، ئیتر با ئەو بێ ئیش و چەنا باز و دەم بازانەش بازاڕی درۆیان بپێچنەوە و واز لەو جۆرە هاراوە و وڕێنانەیان بهێنن و هەركەس بڕواتەوە بۆ مالی خۆی.

**سێهەم:** لە وەلام و ڕەدە بەتال كەرەوەكانی ئەم شوبهە و گومانە، ئەوەیە كە هەندێك لە ئەهلی تەفسیر دەگێڕنەوە كە پاشا (مەلیك) ئیمانی هێناوە بە خوای تاك و تەنها و بانگەوازی یوسف، ئەمەش لە (موجاهید) ی قوتابی (ئیبن عەباس)ەوە گێڕدراوەتەوە، ڕەزای خوایان لێ بێت، ئەم قسەش پالنەری شایەتی ئەم چیرۆكەیە لە بنەڕەتدا ...

وە ئێمە مل دادەنەوێنین بۆ خوای گەوره، وە پێمان وایە و باوەڕمان وایە كە شوێن كەوتنێكی گشتی یان ڕوالەتی ئایەتێك لە كیتابی خوای گەوره شایەنترە لە قسە و تەئویلات و شەق شەقە و فلتە فلت و چەنە بازیی خەلكی، كە بەتال و بێ بنەمان لە بەلگە و بورهان و چەند گومان و شوبهەیەكی شەیتانی زیاتر بەولاوە هیچی تر نین، ئەوەشی بەلگەیە لەسەر ئەم قسەیە، وتەی خوای گەورەیە لە بارەی پێغەمبەر یوسفەوە (علیە السلام) دەفەرموێت: ﴿وَكَذَٰلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي الْأَرْضِ﴾. واتە: ئێمە لە خاكی (میصر) دا پلە و پایە و دەسەلاتمان بە یوسف دا)).

ئەمەش بە كورتییە و گشت گیری یە، و خوای گەوره لە چەند شوێنێكی دیكەی قورئاندا بارو دۆخی ئەو بڕوا دارانەی ڕوون كردۆتەوە، كە لەزەویدا دەسەلات و تەمكین

دەگرنە دەست و لەبارەیانەوە دەفەرموێت: ﴿ الَّذِينَ إِنْ مَكَّنَّاهُمْ فِي الْأَرْضِ أَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ وَأَمَرُوا بِالْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا عَنِ الْمُنْكَرِ وَلِلَّهِ عَاقِبَةُ الْأُمُورِ ﴾الحج٤١. واتە: ئەوانەی کەوا شایستەی ئەوەن کە خوا یارمەتییان بدات و بەرگرییان لێ بکات، کەسانێکن ئەگەر خوا لەم زەوییەدا پایە دارو و بەهێزیان بکات و دەسەڵاتیان بداتێ، نوێژە فەرزەکان بە ڕێك و پێکی دەکەن، ملکەچی فەرمانی خوای گەورە دەبن، و زەکات دەدەن و، فەرمان بە یەکتاپەرستی و چاکە ئەکەن و، ڕێگری کاری شیرك و کوفر و خراپە و فەساد دەگرن و ڕووبە ڕووی فەسادو هێزی شەڕ ئەوەستن، وە کۆتایی و سەرەنجامی هەموو کارەکانیش هەر بۆ خوای تاك و تەنهایە)).

ئەمەش هیچ گومانی تێدا نییە کە (یوسف) سەلامی خوای لێ بێت لەوانە بووە، بەڵکو لە سادە و هەڵبژێر دراوەکانی بووە، کە ئەگەر خوای گەورە لە زەویدا دەسەڵات و مەکانەتیان پێ بدات فەرمان بە یەکتاپەرستی دەکەن و ڕێگری لە شیرك و کوفر دەگرن، وە هیچ شەکو گومانێکی تێدا نییە هەرکەس بە دینی ئیسلام شارەزا بێت گەورەترین مەعروف یان چاکە بریتیە لە (تەوحید) یەکتاپەرستی، کە ئەصل و بنەمای ئوصول و بنچینەی بانگەواز و دەعوەی یوسف و باب و باپیرانی بووە، سەلامی خوا لە هەموویان بێت .

وە گەورەترین مونکەر و خراپەش بریتیە (شیرك)، کە یوسف هەموو کات ئاگاداری دەکردنەوە خۆیانی لێ بپارێزن و دوژمنایەتی و رقە بەرایەتی خواکانیانی دەکرد، وە بەڵگەیەکی زۆر ئاشکرا و بڕاوەیە کە یوسف دوای ئەوەی خوای گەورە دەسەڵات و تەمکینی پێدا، ڕاستگۆ بوو بە ڕێبازی باپیرانی یەعقوب و ئیسحاق و ئیبراهیم، وە فەرمانی کردووە بەم بەرنامە و ڕێبازە و دژایەتی و بەرەنگاری هەڵوەشێنەرەوەکانی و هەموو ئەوشتانەشی کردووە کە پێچەوانە و دژی ئەو ڕێبازە بوون، وە یوسف (علیه السلام) جگە لە حوکمی خوای گەورە حوکمی بە هیچ شتێکی دیکە نەکردووە، وە پەناشی بۆ حوکمی غەیری حوکمی خوای گەورە نەبردووە، وە پەنای بۆ خوا شەرع دانەرەکان و طاغوتە پەرستراوەکان لە جێگەی خوای گەورە نەبردووە، وە قەت نەچۆتە پاڵیان و موالاتی بۆیان نەبووە و پشتی نەگرتوون و شوێن یان نەکەوتووە و تەسلیمی فەرمانیان نەبووە، وەك چۆن ئەمڕۆ بە فیتنە چووەکان دەیکەن لە پلە و پۆستەکانیاندا ....

یوسف شتی وای نەکردووە (جا چ جای) هاوبەشیان بکات و لەگەڵ یان بەژدار بێت، لە دانان و نووسینی تەشریعات و شەریعەت دانانیان، و تێکەڵاوی دەستوریان ببێت، وەك چۆن ئەمرۆ بە فیتنە چووەکانی پەرلەمانەکان دەیکەن، بەڵکو زۆر بێ باکانە دژایەتی و نکوڵی ئەو حاڵ و بارەیانی کردووە، و ئەو خراپە و مونکەرەیانی گۆڕیوە و فەرمانی بە (تەوحید) یەکتاپەرستی کردووە و بانگەوازی بۆ کردووە و هەوڵی بۆ داوە، وە ئەوەی پێچەوانەی بو بێتەوە و دژی وەستابێت دووری خستۆتەوە و لایبردووە و هەڵیوەشاندۆتەوە، جار هەرکەس بوبێت (كائنا من كان) ... وە ئەمەش بە دەق و نەصی ئایەتی خوای گەورە ... وە هیچ کەس باس و وەسفی راستگۆی کوڕی دوو ڕاست گۆکە ناکات بە جگە لەم باس و وەسفە، مەگەر کافرێکی بێ باوەڕی پیس نەبێت، کە دەرچوبێت و بەری بوبێت لە ڕێبازە پاك و خاوێنەکەی...

وە ئەوەشی بەڵگە لەسەر ئەمە دەدات، بەڵگەیەکی ئاشکرا و تەئکید و بێ کومان، تەفسیری ئایەتەکەی سورەتی (یوسف)ە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقَالَ الْمَلِكُ ائْتُونِي بِهِ أَسْتَخْلِصْهُ لِنَفْسِي فَلَمَّا كَلَّمَهُ قَالَ إِنَّكَ الْيَوْمَ لَدَيْنَا مَكِينٌ أَمِينٌ﴾. یوسف٥٤). واتە: پاشای میصر ووتی: یوسفم بۆ بهێنن، با بیکەمە یار و نزیك و پرس و ڕای خۆم، بۆ ڕاگرتنی دەوڵەتەکەم، جا کاتێك یوسف هاتە لای پاشا (مەلیك) و دواندی و وتو وێژی لەگەڵ کرد، پاشا پێی ووت: بەڕاستی لەم ڕۆوە لای ئێمە پیاوێکی ئەمین و خاوەن دەسەڵات و پلە و پایەیت)).

ئایا دەبێت چ قسەیەك بێت لێرەدا کە یوسف بە پاشا (مەلیك)ی میصری ووت؟ یان پاشای میصر گوێبیستی چی بوو؟ کە وا خێرا بەو جۆرە پێی سەرسام بوو، وە یوسفی کردە دەسەڵاتدار و جێی باوەڕی خۆی؟ ئایا وای دەبینی یان پێت وایە یوسف خەریکی باس و خواستی پاکانەی خۆی بووە لە بوهتانەکەی عەزیزی میصر (زولەیخا) بۆی، کە کۆتایی هاتووە و ڕاستی تیایدا دەرکەوتووە؟! ... یان وای دەبینی باسی وەحدە و یەکێتی نیشتیمانی کردووە؟! یان باسی کێشەی ئابوری و ئیقتصادی کردووە ؟! یان ... وە ... وە یان چی؟؟

لێرەدا هیچ کەس بۆی نییە هەر لەخۆیەوە قسەبکات و تەفسیری ئایەتەکە بکات بە نەزانی و نەبوونی بەڵگە و عیلم و تفەنگ بە تاریکیەوە بنێت، خۆ ئەگەر هەرکەس لە خۆیەوە قسەبکات و تەفسیری بکات، ئەوە درۆزنە و لە درۆزنەکانە، بەڵام ئەوەی دیارە و

ئاشكرایه له تەفسیری وتەی خوای گەورە ﴿فَلَمَّا كَلَّمَهُ﴾ واتە: جا كاتێك یوسف قسەی لەگەڵ پاشا كرد )). زۆر ڕوون و ئاشكرایه له وتەكەی خوای گەورە كە دەفەرموێت: ﴿ وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطاغوت ﴾ النحل ٣٦) واتە ئێمە بۆ هەموو گەل و نەتەوەیەك (قەومێك) پێغەمبەرێكمان ڕەوانە كردووە، هەتا بەندایەتی خوای گەورە بكەن و واز له بەندایەتی و گوێڕایەڵی (طاغوت) بهێنن )).

وە هەروەها وتەی خوای گەورە: ﴿ وَلَقَدْ أُوحِيَ إِلَيْكَ وَإِلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِين ﴾ الزمر٦٥) واتە: سوێند بێت وەحی كراوە بۆ تۆو هەموو پێغەمبەرانی پێش تۆش، ئەگەر شەریك بۆ خوای گەورە بڕیار بدەیت، ئەوە بێگومان هەموو كردەوە چاكەكانت پوچەڵ دەبێتەوە، و لەڕەنج بە خەسارەكانیش دەبیت )).

وە هەروەها وتەی خوای گەورە له بارەی گرنگترینی گرنگەكان (أهم المهمات) له بانگەواز و دەعوەی یوسف (علیه السلام) دەفەرموێت: ﴿ إِنِّي تَرَكْتُ مِلَّةَ قَوْمٍ لَا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَهُمْ بِالْآخِرَةِ هُمْ كَافِرُون * وَاتَّبَعْتُ مِلَّةَ آبَائِي إِبْرَاهِيمَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ مَا كَانَ لَنَا أَنْ نُشْرِكَ بِاللَّهِ مِنْ شَيْءٍ﴾ سورةتی یوسف ٣٧ — ٣٨).

واتە: چاك بزانن كە من ڕێبازی (میلەتی) ئەو كەسانەم واز لێهێناوە، كە باوەڕیان بە خوا و ڕۆژی دوایی نییە، وە بۆخۆم كەوتومەتە شوێن ڕێبازی باب و باپیرانم: ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقوب، هەركەسێكی دیكەش ئاوا بكات، هەر ئاوا سەركەوتو دەبێت، وە بۆ ئێمەش نییە (خانەوادەی پێغەمبەران و شوێن كەوتوانیان) هیچ شتێك بكەینە هاوبەش و هاوەڵی خوای گەورە )).

هەروەها وتەی خوای گەورە له بارەیەوە: ﴿ يَا صَاحِبَيِ السِّجْنِ أَأَرْبَابٌ مُتَفَرِّقُونَ خَيْرٌ أَمِ اللَّهُ الْوَاحِدُ الْقَهَّار * مَا تَعْبُدُونَ مِنْ دُونِهِ إِلَّا أَسْمَاءً سَمَّيْتُمُوهَا أَنْتُمْ وَآبَاؤُكُمْ مَا أَنْزَلَ اللَّهُ بِهَا مِنْ سُلْطَانٍ إِنِ الْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ أَمَرَ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا إِيَّاهُ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُون ﴾ سورةتی یوسف ٣٩-٤٠).

واته: ئەی هەردوو هاوڕێی بەندیخانەکەم: ئاخۆ چەند خوایەکی جیا جیا (موتەفەریق) بپەرسترێن چاکترە، یان هەر یەك خوای تاك و تەنها و زاڵ و بە دەسەلآت بەسەر هەموو شتێکدا ؟؟ ئەوەش چاك بزانن ئەوانەی ئێوە لە جێگەی خوا دەیان پەرستن تەنها چەند ناوێکی بێ ناوەڕۆکن، ئێوە و باب و باپیرانتان بە ئارەزووی خۆتان ناوتان ناون و کردوتانن بە خوا/ وە خوای گەورە هیچ بەلگەیەکی بۆ ڕاستی پەرستنی ئەوانە نەناردووە، وە هەموو حوکم و بریارێك تەنها و تەنها هەر هی خوایە، وە دەبێت تەنها هەر ئەو حاکم و بڕیار بەدەست بێت، وە فەرمانی داوە کە: ئێوە دەبێت تەنها بەندایەتی بۆ ئەو بکەن و ئەو بپەرستن و گوێڕایەڵی ئەو بکەن، نەك لە حیزب و عەشیرەت و گروپ و خێڵ .....، هەر ئەو ئاینە (یەکتاپەرستی) ڕاست و ڕەواو پایە دارە، کە پێم ڕاگەیاندی و بانگەوازم بۆ کردی، بەلاّم زۆربەی خەڵکی نازانن کە ئایینی یەکتاپەرستی (تەوحید) ڕاست و ڕەوا یە )).

هیچ گومانی تێدا نییە، کە ئەمە گەورەترین و گرنگترین قسە و بانگەوازی پێغەمبەر یوسف بووە، وە ئەمەیە دینی دامەزراو و پتەو لای ئەو، وە ئەصل و بنەمای نچینە و ئوصولی بانگەواز و دەعوەی و ڕێبازو، ڕێبازی باب و باپیرانی، ئەگەر فەرمانی کرد بە چاکەیەك ئەوە گەورەترین چاکەیە کە دەیزانێت، وە ئەگەر نەهی و ڕێگری کرد لە خراپەیەك، ئەوە نکوڵی و ڕێگری لێ نەکردووە ئەگەر پێچەوانە و دژی ئەصل و بنچینەی بانگەواز و کارەکانی خۆی نەبوبێت، واتە یەکتاپەرستی (التوحید) ... ئەگەر ئەمەش جێگیر بوو، ئەوە وەلاّمی مەلیك بۆی ئاوا دەبێت: ﴿إِنَّكَ الْيَوْمَ لَدَيْنَا مَكِينٌ أَمِينٌ﴾. یوسف٥٤). واتە: بەڕاستی لەم ڕۆوە لای ئێمە پیاوێکی ئەمین و خاوەن دەسەلاّت و پلە و پایەیت)).

ئەمەش بەلگەیەکی ئاشکرایە لەسەر ئەوەی کە پاشا (مەلیك) شوێن پێغەمبەر یوسف (علیه السلام) کەوتووە و ڕازی بووە لەسەری، وە میلەت و ڕێبازی کوفر و بێ باوەڕێ خۆی جێ هێشتووە و شوێن میلەت و ڕێبازی ئیبراهیم و ئیسحاق و یعقوب و یوسف کەوتووە، سەلامی خوایان لێ بێت .

یان ئەگەر دەتەوێت بڵێ: هیچ نەبێت، یان لە کەمترین بارو دۆخدا لێی گەڕاوە لەسەر یەکتاپەرستی (تەوحید) و ڕێباز و میلەتی باب و باپیرانی، یان تەواوی ئازادی ڕەهای بۆ ڕەخساندووە، بە قسەکردن ودەعوە و بانگەوازی یوسف بۆ ڕێبازی یەکتاپەرستی، وە گەوج

کردنی هەموو سەرپێچی کارانی، وە فەرمانی پێ نەکردووە بە شتێك کە دژی یەکتاپەرستی بێت و هەڵی بوەشێنێتەوە، وە ئەوەندەت بەسە بۆ زانینی جیاوازییەکی گەورە لە نێوان ئەم بارو دۆخەی یوسف (علیه السلام) .... لەگەڵ بە فیتنە چووەکان لە شوێن کەوتوانی طاغوتەکان و یارمەتی دەرەکانیان، لە وەزارەتەکانی ئەمڕۆ، یان بەژدار بووەکانیان بۆ شەرع دانان و تەشریع لە پەرلەمانەکانیان ...[٣٢]

---

[٣٢]) تێبینی:

هیچ کەسێك لەسەر ئەو قسەی ڕابردوو چەواشە نەبێت، لە بەڵگە هێنانەوە بەوتەی خوای گەورە کە لە سورەتی (غافر) لەسەر زوبانی باوەڕدارێکی گەلەکەی فیرعەونەوە دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ جَاءَكُمْ يُوسُفُ مِن قَبْلُ بِالْبَيِّنَاتِ فَمَا زِلْتُمْ فِي شَكٍّ مِّمَّا جَاءَكُم بِهِ حَتَّى إِذَا هَلَكَ قُلْتُمْ لَن يَبْعَثَ اللَّهُ مِن بَعْدِهِ رَسُولًا﴾٣٤) واتە: سوێند بەخوا (یوسف)یش لە پێشدا بە چەندان بەڵگە و نیشانەی ڕوونەوە هاتە لاتان بۆ ڕێنمونیتان، کەچی لە پەیامەکەی ئەویش کە پێی هاتبوو بۆتان، هەر لە گومان و دوو دڵیدا بوون، هەتا کاتێك یوسف مرد، ئەوسا وتتان: ئیتر خوا دوای ئەو هیچ پێغەمبەرێکی تر نانێرێت)). لەبەر چەند هۆکارێك:

١- ئایەتەکە بەڵگەیەکی ئاشکراو بێ گومان نییە، لەسەر ئەوەی کە مەبەستی ئایەتەکە پێی (یوسف کوری یەعقوب) بێت، نەخێر ... ڕەنگە ئەو (یوسف)ە مەبەست پێی (یوسف)ێکی دیکە بێت، چونکە هەندێك لە زانایانی تەفسیر دەفەرموون ئەو (یوسف)ە (یوسف)ی کوری یەعقوب نییە، بەڵکو (یوسف) کوری (ئەفرانیم) کوری یوسف کوری یەعقوبە، واتە کوڕەزای پێغەمبەر (یوسف) خۆیەتی، کە بۆ ماوەی (٢٠) ساڵ لەناویاندا بانگەوازی کردووە، ئەمەش لە هاوەڵی موفەسیر (عبدالله ی کوری عەباس)ەوە گێڕدراوەتەوە، واتە ئەمە تەفسیری ئیبن عەباسە، هەروەها ئەمەش وتەی ئیمامی شەوکانی و سەعدی یە، وە دەتوانیت بۆخۆشت سەیری تەفسیری (قرطبي) بکەیت، شتێکی ئاشکراشە بەڵگە ئەگەر ئەگەری کەوتە ناو، بەکار نایەت بۆ بەڵگە هێنانەوە ...

٢- خۆ گریمان ئەگەر، یان فەرەزەن، ئایەتەکەش مەبەستی پێی (یوسف کوری یەعقوب) بێت، سەلامی خوایان لێ بێت، بەهەمان جۆر ئایەتەکە بەڵگەیەکی ئاشکرا نییە لەسەر ئەوەی کە پاشا (مەلیك)ی میصر لەسەر کوفر و بێ باوەڕی خۆی ماوەتەوە، بەڵکو مەبەستی ئایەتەکە پێی لەسەر زۆربەی بەنو ئیسرائیلە ...

٣- ئایەتەکە باسی کوفر و بێ باوەڕی (بەواح) ڕوون و ئاشکرای نەکردووە، بەڵکو باسی شەکو گومانی کردووە، وە گومانیش دەکرێت لە کاتێکدا لە دڵدا بشاردرێتەوە، وە لە کاتێکی تردا ئاشکرا بکرێت، جا ئەگەر ئەوە جێگیر بوو کە (یوسف) پایە دار و دەسەلات دار کراوە لە زەویدا، و فەرمانی بە یەکتاپەرستی و چاکە کردووە و، ڕێگری لە شیرك و خراپە گرتووە، وەك پێشتر باسمان کرد، ئەوە لە هیچ کەسێك قبول ناکات کە لەبەردەمیدا و بە ئاشکرا (شیرك) بکات ... بەڵکو هیچ کەسێك زاتی کاری خراپە و مونکەر ناکات، چونکە ئەو حاکم و دەسەلات دار و لەهەمان کاتیشدا پێغەمبەری خوا بووە، وە خراپترین شت لای ئەو(شیرك) بووە، بەلاَم لەوانەیە ئەمەی لە دڵیدا شاردبێتەوە، و لە ڕواڵەتدا ڕێباز و میلەتی ئیمانی نیشان دابێت، ئەویش لە ترسی سوڵتان و دەسەلاَتداری حەق ... ئەمەش پێی دەوترێت نیفاق و دوو ڕوویی، وە

**چوارەم:** ئەگەر لەوانەی باسمان کردوو ڕونمان کردەوە بەباشی تێگەیشتی، وە بە تەواوی بۆت بووە یەقین و دڵنیایی، کە بوون بە وەزیری یوسف، یان گرتنە ئەستۆی وەزارەت بۆ یوسف، پێچەوانەی یەکتاپەرستی (تەوحید) نەبووە، وە دژو پێچەوانە و هەڵوەشێنەری میلەت و ڕێبازی ئیبراهیم نەبووە، وەك چۆن ئەمە حاڵی ئەوانەیە کە لەم سەردەمەدا دەبنە وەزیر .

پاشان گریمان یان فەرەزەن وای دانێین کە پاشای میصر لەسەر کوفر و بیرو باوەری باپیرانی خۆی مابێتەوە ... ئەوە کارکردن و گرتنە ئەستۆی یوسف بۆ ئەو ویلایەت و فەرمان ڕەواییە بابەتێکە لە بابەتە فەرعی و لاوەکی یەکان، کە لە بنچینەی ئاییندا هیچ گرفتێکی لەسەر نییە، لەبەر ئەوەی لە پێشتردا بۆمان سابت بوو، یان بۆمان جێگیر بوو، کە یوسف شیرك یان کوفر یان پشتگیری کافران یان شەرع دانانی لەگەڵ خوای گەورە نەکردووە، بەڵکو فەرمانی بە یەکتاپەرستی (تەوحید) کردووە، و ڕێگری نکوڵی هەموو ئەو خراپانەشی کردووە وەك شیرك و کوفر و تەشریع و پشت گیری کافران، وە هەروەها خوای گەورەش لە بارەی مەسائیلە فەرعی و لاوەکی یەکان دەفەرموێت: ﴿لِكُلّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا﴾ المائدة٤٨).

واتە: بۆ هەر یەکێك لە ئەهلی کیتابەکان یەك بە دوای یەك شەریعەت و مەنهەجێکمان

---

دوو ڕوانیش لە دونیادا بە ڕواڵەت هەڵسوکەوتیان لەگەڵ دەکرێت، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿**حَتّى إذَا هَلَكَ قُلْتُمْ لَن يَبْعَثَ اللهُ مِن بَعْدِهِ رَسُولًا**﴾٣٤) واتە: هەتا کاتێك یوسف وەفاتی کرد، ئەوسا وتتان: ئیتر خوا دوای ئەو هیچ پێغەمبەرێکی تر نانێرێت)). ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئیمانی ئەوان، بە پێغەمبەرێتی یەکەی، ئەگەر بە ڕووکەش و ڕواڵەتیش بێت ...

وە لێرەدا ئاگادارییەك پێویستە، بۆ هەندێك لەو بە فیتنە چووانەی کە لە شوبهە و گومانەکانیان دان بۆ ئەم بابەتە، باسی باوەر دارەکەی خزمی فیرعەون دەکەن، بە بەڵگەی ئەوەی ئیمانەکەی خۆی شاردۆتەوە ... ئێمەش پێیان دەڵێین: ڕووی بەڵگە لە کوێ یە؟ لە نێوان نیزاع و مشتومڕی ئێمە و ئێوە لە چیرۆکی ئەو کەسە ئیمان دارەدا؟ لە ڕاستیدا جیاوازی و فەرقێکی گەورە و فراوان هەیە لە نێوان شاردنەوە و کیتمانی ئیمان و شاردنەوەی بۆ کەسێکی بێ دەسەڵات، لەگەڵ بەشداری کردن لە کوفر و شیرك و تەشریع و شەریعەت دانان و کۆبونەوە و دەست تێکەڵاو کردن لەسەر دینێك لە جێگەی دینی خوای گەورە، ئایا دەتوانن بۆمان بسەلێنن کە ئەو کەسە ئیمانداری ئێوە باسی دەکەن شەریعەتی داناوە، یان خەریکی تەشریع بوو بێت؟ وەك ئێوە خەریکی شەرع دانانن، یان ئەو بەژداری لە حوکمی بە غەیری حوکمی خوای گەورە کردووە، وەك ئێوە بەژدارن، یان ئەو لەگەڵیان لەسەر دیموکراسی یان دینی غەیری خوای گەورە کۆبۆتەوە هەروەك ئێوە دەیکەن؟؟؟ لە پێشدا چاك لە شتەکان تێبگەن پاشان بیکەنە بەڵگە .... ئەگەر نا واز لەو زۆر بڵێیی و چەنەبازی و شەق شەقانە بهێنن ...

داناوه، یان بۆ هەر پێغەمبەرێك كە ناردوومانن شەریعەت و مەنهەجێكمان ناردووه، یەك بە دوای یەك كتێب و بەرنامەمان بۆ ناردن، هەتا كۆتا شەریعەت كە ئیسلامە )).

جا دەكرێت شەریعەتی پێغەمبەران لە بڕیارە فەرعی و لاوەكیەكانـدا جۆراو جۆر و جیاواز بن، بەڵام لە باب و باسی یەكتاپەرستی (تەوحید)دا هەموویان یەكێكن، واتە جیاوازی یان نییە، بەو بەڵگەی لە صەحیحی (بوخاری)دا هاتووە ئەبو هورەیرە دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (( نحن معاشر الأنبياء إخوة لعلات ديننا واحد )). واتة : ئێمەی كۆمەڵَی ثێغەمبەران براین لە باوكێك و دایكی جیاواز، دین و ئاینمان یەكێكە )).

واتە: بران لە دایكی جیاواز، بەڵام باوكیان یەكێكە ... ئەمەش ئاماژەیە بۆ ڕێكی و هاوبەشی و ڕێككەوتن لە ئەصل و بنەمای یەكتاپەرستی و، جیاوازی و جۆرا و جۆری لە فەرع و فروعی ئەحكامەكانی شەرعدا ... چونكە دەكرێت هەندێك جار شتێك لە بابی شەریعەتی پێش خۆماندا حەرام بووبێت، پاشان بۆ ئێمە حەڵاڵ كراوە، بۆنمونە وەك (غەنیمەت) كە پێی دەووترێن دەستكەوتی جەنگ، وە هەروەها بە پێچەوانەشەوە، شتێك بۆئەوان حەڵاڵ بێت، بەڵام دوایی لەسەر ئێمە حەرام كرابێت، یان شتێك لەسەر ئەوانەی پێش ئێمە قورس كرابێت بەڵام دوایی لەسەر ئێمە ئاسان كراوە، ئیتر بەوجۆرە، لەبەر ئەوە هەر شەرعێكی پێش شەریعەتی ئێمە شەریعەت نییە بۆ ئێمە، بە تایبەت ئەگەر شتێك بە بەڵگەوە پێچەوانەی شەریعەت بێت .

هەروەها لە شەریعەتی ئێمەدا (ئیسلام) بەڵگەی صەحیح هەیە لەسەر نادروستی ئەو شتەی كە بۆ یوسف شەرعی بووە، سەلامی خوای لێ بێت، وە بۆ ئێمە دروست نییە و حەرامە لەسەر مان كە ئەنجامی بدەین، بەو بەڵگەی (ئیبن حەببان) و (ئەبو یەعلا) و ئیمامی (طەبەرانی) و غەیری ئەوانیش لە ئەبو هورەیرە وە دەگێڕنەوە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ((لَيَأْتِيَنَّ عَلَيْكُمْ أُمَرَاءُ يُقَرِّبُونَ شِرَارَ النَّاسِ، وَيُؤَخِّرُونَ الصَّلَاةَ عَنْ مَوَاقِيتِهَا، فَمَنْ أَدْرَكَ ذَلِكَ مِنْكُمْ فَلَا يَكُونَنَّ عَرِيفًا، وَلَا شُرْطِيًا، وَلَا جَابِيًا، وَلَا خَازِنًا)).[٣٣] واتە:

---

[٣٣] ) صحيح: الحديث أخرجه ابن حبان في صحيحه كتاب السير باب طاعة الامامة حديث رقم ٤٦٦٩ ، وأخرجه ابي يعلى الموصلي في مسنده مسند ابي سعيد الخدري حديث رقم ١٠٧٧ ، واخرجه ابن حجر في المطالب العالية كتاب

بێ گومان هەندێك ئومەرائو كاربەدەست دەبنە فەرمان ڕەواتان، كە خەڵكى خراپ و نا مەسئول لە خۆیان نزیك دەكەنەوە و پۆست یان پێدەدەن و، نوێژەكان لە كاتى ئەفزەڵی خۆیاندا دوا دەخەن، ئەگەر هەر كەسێك لە ئێوە گەیشت بەو كار بەدەستانە، ئەوە بە هیچ جۆرێك نەبێتە: عەریف و، پۆلیس و، باج سێن و، گەنجینە وانیان )).

ئەوەی ڕاست بێت ئەوەیە ئەو كار بەدەستانەی كە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) باسیان دەكات، كاربەدەستی كافر و بێ باوەڕ نین، بەڵكو فاجیر و سەفیهن، چونكە كەسی ئاگادار كار كە ئاگاداری شتێك دەدات، ئەوە بەردەوام باسی خراپی ئەو كارە دەكات، یان باس خراپ ترین شتی دەكات، خۆ ئەگەر ئەو حاكم و كار بەدەستانە كافر بوونایە پێغەمبەری خوا باسی دەكردن، بەڵام گەورەترین تاوان و جەریمە كە ئەوان دەیكەن تەنها بریتیە لە دواخستنی نوێژەكان و، نزیك كردنەوەی كەسانی خراپ لە خۆیان ... لێرەدا تەنها لەبەر ئەمە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ڕێگری و نەهی ئاشكرای كردووە لەوەی كە مرۆڤ ببێتە (خازن) واتە (گەنجینە وان) یان ... خۆ ئەگەر بوون بە پیشەی (گەنجینە) وانی حاكم و كار بەدەستانێكی فاجیر ڕێگری و نەهی لێكرابێت و لە شەرعی ئێمەدا حەرام بێت، ئایا ئەی چی بە بوون بە وەزیری گەنجینە وان، لەلای پاشا و مەلیكی كافر و كاربەدەستی موشریك ؟؟ ﴿قَالَ اجْعَلْنِي عَلَى خَزَائِنِ الْأَرْضِ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٌ﴾يوسف ٥٥) واتە: یوسف بە پاشای میصری ووت: بمكە بە سەركار و بەرپرسی خەزێنە و گەنجینە و واریداتی میصر، چونكە من بۆ ئەو كارە چاودێرێكی باش و، پارێزەرێكی زانا و بە ئاگام )).

---

الخلافة باب العرافة حديث رقم ٢٢٢٢ رواه ابن حبان، وابو يعلا والطبري، وصححه الالبانى رحمه الله في السلسلة الصحيحة برقم (٣٦٠) / (٣٠٧/١) و صحيح الترغيب والترهيب برقم (٧٩٠)

تێبینی:

فەرموودەكە بەم شێوازەش هاتووە بەڵام شێخ ئەلبانی ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێت سەنەدەكەی لاوازە:

روى الطبراني في "الصغير" و"الأوسط" عن أبي هريرة رضي الله عنه، قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (يكون في آخر الزمان لأمراء ظلمة، ووزراء فسقة، وقضاة خونة، وفقهاء كذبة، فمن أدرك ذلك الزمان منكم؛ فلا يكون لهم جابيا ولا عريفا ولا شرطيا).

**واحسرتاه تقضي العمر وإنصرمت ** ساعاته بين ذل العجز والكسل**

**والقوم قد أخذوا درب النجاة وقد ** ساروا إلى المطلب الأعلى بلا مهل**

ئەمـە دەلیلێکـی صـەحیح و بەڵگـە و بورهـانێکی ئاشـکرایە، لەسـەر ئـەوەی کـە ئەمـە لەشەرعی پێش خۆماندا بووە، وە ئەمەش لە شەریعەتی ئێمەدا نەسخ بۆتەوە و سڕاوەتەوە … والله أعلم.[٣٤]

وە (هـذه كفايـة … لمـن أراد الهدايـة) ئەمـەش بەسـە …. بـۆ ئـەو کەسـەی هیدایـەت و ڕێنمویی مەبەستە، بەڵام ئەو کەسەی بە چاك زانـین و بـە بـاش زانـین و قسە و بۆچونەکانی ئەم و ئەو پێش بخات بەسەر بەڵگە و دەلیلە شـەرعی یەکانـدا، ئـەوە ئەگـەر چیاکان لـە پـێش چاویدا لێکبدەن هەرگیز هیدایەت و ڕێگەی ڕاستی دەست ناکەوێت …. ﴿وَمَنْ يُرِدِ اللَّهُ فِتْنَتَهُ فَلَنْ تَمْلِكَ لَهُ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا … ﴾ المائدة٤١). واتـە : هەرکەسـێك خـوای گـەورە بیـەوێت کـافر و گـومڕای بکات، ئەوە تۆ لەبەرامبەر خوادا هیچت پێ ناکرێت بۆی )).

وە لە کۆتاییدا پێش ئەوەی قسەکانم لەسەر ئەم گومانە تەواو بکەم، بە پێویستی دەزانم کە ڕوونکردنەوەیەك بکەم لەسەر ئەوەی کە هەندێك لەو گومڕاو بە فیتنە چووانە کـە شـیرك و کوفریـا تێکـەڵ کـردووە بەسـەر یەکـدا، و بـە گومـان و قسـە و بـە چـاك زانینـەکانیان، ڕێگـە خـۆش دەکـەن بـۆ چـوونە نـاو (وەزارەت) و (پەرلەمانـە) شـیرکی و کـوفری یـەکان، بەمەشـەوە دانانیشـن و ناوەسـتن، وە هەسـتاون بـە تێکـەڵ کردنـی وتەیـەکی شـێخی ئیسـلام ئـیبن تەیمیـە (رحمـە الله) بـە شـوبهە و گومانـەکانی خۆیـان، لـەبارەی گرتنـە ئەسـتۆی وەزیریـی پێغەمبـەر یوسف لای پاشای میصر، وە ئەمە لە ڕاستیدا شاردنەوەی هەق و ڕاستی یە بـە باتـڵ و ناهـەقی و درۆ، وە درۆکردن و ئیفترائە بەدەم شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیەوە ڕەحمـەتی خـوای لـێ بێت، لە شتێکدا کە هەرگیز نەی ووتووە.

شێخی ئیسلام هەرگیز نـەهاتووە چـیرۆکی (یوسـف) بکاتـە بەڵگـە بـۆ بـەژداری کـردن لـە تەشریع و شەرع دانـان و کـوفر و شـیرك و حـوکم کـردن بـە غـەیری حـوکمی خـوای گـەورە … پەنا بەخوا … بەڵکو ئێمە لێرەدا شێخی ئیسلام و دینەکەی بەڵکو تەنانـەت عـەقڵی ئـەو کەڵـە پیاوە بە پاك ڕادەگرین لە هاوشێوەی ئەم جۆرە قسە ناشرینانە، کە تا ئێستا هـیچ کـەس زاتـی ئەوەی نەکردووە ئەو جۆرە قسانە بکات، تەنها لەم دواییانەی ئاخیر نـەبێت، کـە کۆمـەڵێك بـێ

[٣٤] ) ئەمەیان گریمان ئەگەر وابوو، گریمان ئەگەر یوسف (علیه السلام) بوویە گەنجینە وانی پاشایەکی کافر.

شەرم و ئابڕو بانگەوازی بۆ دەکەن... وە دەڵێین: هەتا بەو جۆرەی ئەگەر قسەکەشی لەم بارەوە نەخوێنینەوە، چونکە قسەی لەم جۆرە هیچ کەسێکی ژیر و عاقڵ نایڵێت، جا چ جای (فەزڵەن) لە زاری پیاوێکی عالم و ڕەبانی و لەخوا ترسی موجاهید وەك شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە (لانزکیه علی الله).... جا چۆن شتی وا، کە ئەو قسە و هەڵوێستی لەم بارەوە ڕوون و ئاشکرایە ... کە هەموو قسەکانی هەر دەڕژێن بەسەر (قاعیدە) ی : ((درء أعظم المفسدتين، وتحصيل أعلى المصلحتين، عند التعارض)). واتە: دوور خستنەوەی دوو خراپە و مەفسەدەی گەورە، بە بەدەست هێنانی بەرز ترینی دوو بەرژەوەندی و چاکە ، لەکاتی دژ بوونەوەیاندا)).

وە زانیت کە گەورەترین مەصلەحەت و بەرژەوەندی لە بووندا بریتیە لە بەرژەوەندی (تەوحید) یەکتاپەرستی، وە گەورەترین خراپە و مەفسەدەش بریتیە لە خراپە و مەفسەدەی شیرك و هاوبەشی دانان (تندید) ... هەروەها شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە باسی کردووە، کە (یوسف) سەلامی خوای لێ بێت، ئەوەی لە توانایدا بووە کردوویەتی و هەستاوە پێی بۆ عەدل و دادگەری و چاکە و ئیحسان، هەروەك لە (حِسبَة) دا، کاتێك باس و وەسفی گرتنە ئەستۆ و ویلایەتی یوسف دەکات دەفەرموێت: ((وَفَعَلَ مِنَ العَدلِ والخَيرِ ما قَدَرَ عليه و دعاهُم إلى الإيمان والإحسان بحسب الامكان)).[٣٥] واتە: ئەوەی لە توانایدا بووە کردوویەتی بۆ داد گەری و عەدالەت و خێر و چاکە، وە بانگەوازی کردووە بۆ ئیمان و چاکە کاری، بە پێی توانا)).

هەروەها دەفەرموێت: (( **لكن فعل الممكن من العدل والاحسان** )). واتە: بەڵام ئەوەی لە توانایدا بووە، کردوویەتی لە عەدل و چاکە کاری )).

وە هەرگیز باسی ئەوەی نەکردووە کە (یوسف) سەلای خوای لێ بێت شەریعەتی لەگەڵ شەرعی خوای گەورە دانابێت، یان بەژداری لە حوکمی غەیری حوکمی خوای گەورەدا کردبێت، یان شوێن (دیموکراسی) و دینە بەتاڵ کەرەوەکانی دینی خوای گەورەی کەوتووە، وەك ئەوە حاڵی ئەو گومڕاو بە فیتنە چووانەیە، کە وتە پاکەکانی ئەو کەڵە پیاوە بە شوبهە و بەڵگە بەتاڵ و سەقەتەکانیانەوە دەبەستنەوە و تێکەڵی دەکەن، بۆ گومڕا کردن و سەر لێ

[٣٥] ) مجموع الفتاوى (ج٢٨/ ص٦٨).

شێواندنی ئەجەر و گوجەرەکان و، شاردنەوەی هەق وراستی بە ناهەق و باتڵ و، نوور و ڕووناکی بە زەلآم و تاریکی ...

پاشان ئێمە ئەی برایانی یەکتاپەرست ... قائید و بەلگەمان کە هەموو کات دەگەڕێینەوە بۆلای کاتی نیزاع و ناکۆکی، تەنها وەحی یە و هیچی تر نییە بەولاوە، واتە وتەی خوای گەورە و وتەی پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) ... وە هەموو کەس لە دوای پێغەمبەرەوە قسەی لێ وەردەگیردرێت و دەشدرێتەوە بە ڕویدا، خۆ ئەگەر هاوشێوەی ئەوەی کە پێتان وایە لە شێخی ئیسلامەوە وترابێت، وە حاشا کە شێخی ئیسلامیش شتی وای نە ووتووە، هیچ کاتێك نە لەو، وە نەلە هیچ زانایەکی لەو گەورەتری وەرناگرین، هەتا بەلگەی صەحیح لە قورئان و سوننەتمان بۆ نەهێنێت ... ﴿قُلْ إِنَّمَا أُنْذِرُكُمْ بِالْوَحْيِ﴾. الانبیاء٤٥).واتە: ئەی (محمد) پێیان بلێ من تەنها بە وەحی —نیگا- ئاگادارتان دەکەمەوە)) ... ﴿قُلْ هَاتُوا بُرْهَانَكُمْ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ﴾. البقرة ١١١). واتە: پێیان بلێ دە بەلگەکانتان بهێنن ئەگەر ڕاست دەکەن )).

لەبەر ئەوە ئاگادار بە ... وە (تەوحید) یەکتاپەرستی بە ددانە خرێ کانت بگەزە و بیگرە، وە نەکەیت لە ڕێگە لابدەیت یان بە هەڵەدا بچیت، بە تەلبیسات و فرت و فێل و پڕو پاگەندەی شوێن کەوتوانی شیرك و دوژمنانی یەکتاپەرستی... وە یان پێت وابێت زەرەر مەند دەبیت بە موخالەفە و پێچەوانە کردنیان، وە هەموو کات لە ئەهل و دەستەی وەستاو لەسەر دینی خوای گەورە بە، وەك پێغەمبەری خوا باسیان دەکات و دەفەرموویت: ((لا يَضُرُّهُم مَن خالَفَهُم وَلا مَن خَذَلَهُم حَتى يَاتِيَ أمر الله وَهُم علی ذلك)). واتە: هەرکەس پێچەوانەیان بوەستێتەوە زەرەریان پێ ناگەیەنێت، وە ئەوەشی کە دژایەتی و زەم و بەر بەرەکانێیان دەکات، هەتا فەرمانی خوا دێت ئەوان هەر ئاوا دەمێننەوە لەسەر دینی خوای گەورە و هەق و یەکتاپەرستی )).

## گومانی دووەم :

## ( أن النجاشي لم يحكم بما أنزل الله ومع ذلك كان مسلما )

## ( نەجاشی ) پاشای ( حەبەشە ) بە حوکمی خوای گەورە حوکمی نەکردووە، لەگەڵ ئەوەشدا موسوڵمان بووە

بەهەمان جۆر، هەوەس بازەکان هەر بە چیرۆکی پێغەمبەر (یوسف)ەوە سەلامی خوای لێ بێت نەوەستان، بەڵکو بازیان هەڵدا بۆ چیرۆکی پاشای حەبەشی کەناوی (نەجاشی) بوو، هەتا بیکەنە پینە و پەرۆ کردن بۆ کار کردنیان لە ژێر سێبەری راحەتی طاغوتە شەرع دانەرەکان، جا ئایا ببنە فەرمان ڕەوا، یان ئەندامی پەرلەمان یان شتی تر...

زۆر چاو قاییمانە دەڵێن: نەجاشی حوکم و فەرمان ڕەوایی نەکرد بە حوکمی ئەوەی خوای گەورە ناردویەتی، هەتا پاش موسوڵمان بونیشی، وە هەر لەسەر ئەمەش مایەوە هەتا مرد، وە لەگەڵ ئەمەشدا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بە بەندەیەکی صالح و چاکە کاری ناو بردووە، و نوێژی نادیار (صلاة الغائب) یشی لەسەر کرد و، فەرمانی بە هاوەڵەکانیش کرد کە نوێژی لەگەڵدا لەسەر بکەن بە نادیاری ... و هاوشێوەی ئەم قسە لارو لەوێرانە، کە لە دڵانێکی ڕەش و نەخۆشەوە نەبێت هەرگیز دروست نابن و دەرناچن .

### ئێمەش بە تەوفیقی خوای گەورە پێیان دەڵێین:

**یەکەم:** پێویستە لەسەر ئەو کەسەی کە ئەم شوبهە بەتاڵە دەکاتە بەڵگە، پێش هەموو شتێك دەبێت بە بەڵگەی صەحیح و ئاشکرا و ڕەوان و بڕاوە، بۆمان بسەلمێنێ کە نەجاشی پاشای حەبەشە حوکمی نەکردووە بەوەی کە خوای گەورە دای بەزاندووە بۆ سەر پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، واتە حوکمی نەکردووە بە حوکمی ئیسلام پاش موسوڵمان بونیشی .

هەرچەند بۆخۆم زۆر پێداچوونم کردووە بۆ هەموو قسەکانیان لەسەرەتاوە بۆ کۆتا، بەڵام لە قسە و قسەڵۆك و قالو قیلی ئەم ئەو بەولاوە هیچی تر لە هەگبەیاندا نییە، وە تەنها بەڵگەیەکی ڕاست و صەریح لە کیتاب و سوننەتدا نابینیت لەسەر ئەم باسە لە قسەو قسەڵۆکە کانیاندا، وە خوای گەورەش دەفەرموێت: ﴿قُلْ هَاتُوا بُرْهَانَكُمْ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ﴾. البقرة ١١١).
واتە: پێیان بڵێ دە بەڵگەکانتان بهێنن ئەگەر ڕاست دەکەن)). خۆ ئەگەر بە بەڵگە و

بورهانەوە نەهاتن لەسەر ئەم باسە، ئەوە لە راست گۆکان نین، بەڵکو ئەوانە لە ساختەچی و درۆزنەکان ...

**دووەم:** ئەوەی کە لەنێوان ئێمە و ئەواندا شتێکی ئاشکرا و حاشا هەڵنەگرە، ئەوەیە کە (نەجاشی) پێش کامڵ بوون و تەواو بوونی (شەریعەت) مردووە، وە ئەو رێك بە دەقیقی پێش دابەزینی ئایەتی (۱۱۱)ی سورەتی (البقرة) مردووە، کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الْإِسْلَامَ دِينًا﴾. واتە: ئەمڕۆ ئایینەکەتانم بۆ کامڵ و تەواو کردوون، وە چاکە و بەرەکەتی خۆم ڕشتووە بەسەرتاندا، کە ئایینی ئیسلام دین و ئاین تان بێت )). ئەم ئایەتە لە (حَجّ الوَداع) حەجی ماڵ ئاوایی دابەزی و نازڵ بوو، وە نەجاشی پاشای حەبەشەش بە ماوەیەکی زۆر پێش فەتح و ڕزگار کردنی (مەککە) مردووە، وەك چۆن (حافظ) ئیبن کەثیر و غەیری ئەوانیش باسیان کردووە ...[٣٦]

جا ئەوەی لەسەر نەجاشی پێویست بوو لەو سەردەمەدا کە حوکمی پێ بکات، حوکم کردن و کارکردن بووە بەوەی کە پێی گەیشتووە لە ئایینی ئیسلام، چونکە حوکم کردن و کارکردن لەم کاتەدا دەبێت تەنها بەوە بێت کە پێی گەیشتووە لە شەریعەت، ئەگەر شتێکی پێ نەگات هەر لەخۆوە کار و حوکم بە چی بکات؟؟، چونکە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَأُوحِيَ إِلَيَّ هَذَا الْقُرْآنُ لِأُنْذِرَكُمْ بِهِ وَمَنْ بَلَغَ﴾. واتە: ئەم قورئانەم بۆ نێردراوە هەتا ئێوەی پێ بترسێنم و ئاگادارتان بکەمەوە لە سزای خوای گەورە و عەزابی دۆزەخی، وە بۆ هەر کەسێکی دیکەش کە پێی دەگات )).

وە هەروەها شتێکی ئاشکراشە لای هەمووان، کە لەو سەردەمەدا هۆکار و وەسیلەکانی نەقڵ و گواستنەوە وەك ئێستا نەبووە، ئەگەر هەندێك حوکم و دەقی شەریعەت نازڵ ببووایە، ئەوا خێرا بە ئاسانی بە مرۆڤ نەدەگەیشت و بڵاو نەدەبوویەوە، مەگەر دوای ساڵانێکی زۆر نەبوایە، یان لەوانەشە هەر کەس نەی زانیبایە هەتا خەڵکی خۆیان پاش بڕینی ڕێگایەکی زۆر نەچونایە بۆلای پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، هەروەها دین ئێشتا شتێکی نوێ بووە و قورئان بە لێشاو دادەبەزی و شەریعەتیش کامڵ و تەواو نەکرابوو ... وە لەسەر ئەمەش

[٣٦] ) البداية والنهاية (ج٣/ص٢٧٧).

بەڵگەیەکی زۆر ئاشکرا هەیە، کە لە صەحیحی بوخاری و جگە ئەویشدا هاتووە کە (عبدالله ی کوری مەسعود) خوای لێ ڕازی بێت دەگێڕێتەوە: ((كنا نسلم على نبي صلى الله عليه وسلم في الصلاة فيرد علينا، فلما رجعنا من عند النجاشي سلمنا عليه، فلم يرد علينا، وقال: إن في الصلاة شغلا)). واتە: ئێمە پێش ئەوەی بچین بۆ حەبەشە لە نوێژدا سەلامان لە پێغەمبەری خوا دەکرد (صلى الله عليه وسلم) وە ئەویش وەلامی دەداینەوە ، بەلاّم کاتێك لە حەبەشە و لای نەجاشی گەراینەوە پێغەمبەری خوا لە نوێژدا بوو سەلامان لێکرد بەلاّم وەلاّمی نەداینەوە و، پاش تەواو بوونی نوێژەکە فەرمووی : ((إِنَّ فِي صَلاةِ لَشُغْلاً)) واتە لە نوێژدا وتوێژ هەیە لەگەڵ خوای گەورەدا)).[37]

ئەگەر ئەو هاوەڵە بەرێزانە کە لەلای (نەجاشی) پاشای (حەبەشە) بوون، ئەم هەواڵەیان پێ نەگەیشتبوو، لەگەڵ ئەوەی زمانی (عەرەبی)یان بە چاکی دەزانی و، بەردەوام هەموو کات چاودێری هەواڵ و فەرمانی پێغەمبەری خوا بوون (صلى الله عليه وسلم)، کە قسە کردن لە نوێژدا نەسخ بۆتەوە و سڕاوەتەوە، لەگەڵ ئەوەی کە نوێژ عیبادەتێکی ئاشکرایە و پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە شەو و ڕۆژێکدا پێنج جار بە کۆمەڵ و جەماعەت بۆ خەڵکی

---

[37] ) تێبینی:

واتایی ((لشغلا)) ئەوەیە : لە نوێژدا مەشغوڵ بوون و سەرقاڵ بوون بە خوێندنی قورئان و پاڕانەوە وذیکر و تەعظیمی خوای گەورە هەیە ... لەبەر ئەوە دروست نییە خۆ مەشغوڵ کردن و سەرقاڵ بوون بە شتی دیکەوە لە قسە و جوڵە.

وە هەروەها لە فەرمودەی دیکەدا کە موسلیم دەیگێڕێتەوە بۆمان ، ئیبن مەسعود دەڵێت : **(( فقال لي بيده هكذا))** وە لە ریوایەتێکی دیکەدا دەفەرموێت : **(( فأشارَ إلي))** واتە بەدەست ئیشارەتی بۆ کردین و وەلاّمی داینەوە ،،،، وە فەرموودەکەی بوخاری کە دەڵێت : وەلاّمی نەداینەوە مەبەست پێی بە وتە بووە واتە بە دەم وەلاّمی نەداینەوە ، بەلاّم بەدەست وەلاّمی داینەوە.

وە فەرموودەکەش بەڵگەی ئەوەیە کە سەلام کردن لە کەسی نوێژ خوێن دروستە ئەگەر لە نوێژدا بێت ، وە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کە سەلامیان لێ کرد نکوڵی لێ نەکردن ، وە نەسخیش نە بۆتەوە ، بەڵکو ئەوەی نەسخ بۆتەوە تەنها وەلاّمدانەوەی سەلامە بە دەم ، واتە بە وتە ، بەلاّم وەلاّم دانەوەی سەلام بە ئیشارەت هەر وەك خۆی ماوەتەوە .. وەك لە فەرموودەکەدا هاتووە ..

دەكرد ... ئەی ئایا چی بە تەواوی عیبادەت و پەرستش و تەشریع و حدود و سنورە شەرعی یەكانی دیكە كە هیچ كات وەك نوێژ كردن ڕۆژی (پێنج) جار دووبارە نابنەوە ؟؟؟

ئەی هیچ كام لەوانەی كە شوێن شیركی (دیموكراسی) كەوتوون، ئەمڕۆ دەتوانن بڵێن و بانگەوازی ئەوە بكەن، كە قورئان و ئیسلام یان دینیان پێ نەگەیشتووە، هەتا قیاسە فاسد و چەوت و باتڵەكەی بە حاڵی نەجاشی یەوە بشوبهێنێت، لە كاتێكدا نە ئاین بۆخۆی كامڵ و تەواو بوو بوو، نە تەواوی ئاینیش بەو گەیشتبوو ؟؟؟

**سێیەم:** پاشان ئێمە بەڵگەی ڕاست و صەحیح مان لەبەردەستدایە، هەر لە قورئانەوە بۆ فەرموودە پاشان بۆ وتەی هاوەڵان و شوێن كەوتووان و زانایانی ئەهلی سوننە و جەماعەت، كە (نەجاشی) پاشای حەبەشە كابرایەكی یەكتاپەرست بووە و، حوكمی بە حوكمی خوای گەورە كردووە (بما أنزل الله)، وەهەر بەیەك تاپەرستی (موەحید)ی مرد، چونكە نەصی ئایەتی لەسەرە و، خوای گەورە لە سورەتی (ئەلمائیدە)دا لەبارەیەوە دەفەرموێت : ﴿لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ النَّاسِ عَدَاوَةً لِلَّذِينَ آمَنُوا الْيَهُودَ وَالَّذِينَ أَشْرَكُوا وَلَتَجِدَنَّ أَقْرَبَهُمْ مَوَدَّةً لِلَّذِينَ آمَنُوا الَّذِينَ قَالُوا إِنَّا نَصَارَى ذَلِكَ بِأَنَّ مِنْهُمْ قِسِّيسِينَ وَرُهْبَانًا وَأَنَّهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ﴾ المائدة: ٨٢) واتە ...... ئەی محمد : بێ گومان دەبینی و بۆت دەردەكەوێت كە بەسوود ترینی خەڵكانی جیهان بەرانبەر ئەوانەی باوەڕیان هێناوە، ئەو كەسانەن كە ووتیان : ئێمە نەصارا و هاوەڵی عیساین (علیه السلام)، چونكە هەندێكیان تێدایە زانا و خواپەرست و گۆشە گیرن، خۆیان یەكلا كردۆتەوە بۆ خوا، وە خۆبەزل زان و فیزاوی نین )) ... زانایانی تەفسیر وەك ئیمامی (طەبەری) و (جەلالەدینی سیوطی) و (جەلالەدینی ئەلمحەلا)، كە پێیان دەڵێن (الجلالین) و (ئیبن كەثیر) و (ئیبن عەباس) و زۆرێكی دیكە دەفەرموون : ئەم ئایەتە لەبارەی نەجاشی و هاوەڵەكانییەوە هاتە خوارێ (نازڵ) بوو، كاتێك (جەعفەری كوری ئەبو طالیب)ی ئامۆزای پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە حەبەشە پەنای بۆ بردن و سورەتی (یس) ی بۆ خوێندن، بەو جۆرە ئەوان تێر گریان و بە فرمێسك ڕیشیان تەڕبوو/ وەك لە ئایەتەكەدا هاتووە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا سَمِعُوا مَا أُنْزِلَ إِلَى الرَّسُولِ تَرَى أَعْيُنَهُمْ تَفِيضُ مِنَ الدَّمْعِ مِمَّا عَرَفُوا مِنَ الْحَقِّ يَقُولُونَ رَبَّنَا آمَنَّا فَاكْتُبْنَا مَعَ الشَّاهِدِينَ * وَمَا لَنَا لَا نُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَمَا جَاءَنَا مِنَ الْحَقِّ وَنَطْمَعُ أَنْ يُدْخِلَنَا رَبُّنَا مَعَ الْقَوْمِ الصَّالِحِينَ * فَأَثَابَهُمُ اللَّهُ بِمَا قَالُوا جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَذَلِكَ جَزَاءُ

الْمُحْسِنِينَ ﴾...»[٣٨] هەتا ئیمامی طەبەری دەفەرموێت : کاتێك نەجاشی گوێبیستی بوو کەوتە رێ هەتا بێت بۆلای پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بەڵام لە رێگەدا کۆچی دوایی کرد و مرد، ئیتر پێغەمبەری خوا هەر لە مەدینە هاوەڵەکانی ئاگادار کردەوە و نوێژی نادیار (صلاة الغائب) لەگەڵ هاوەڵە بەرێزەکاندا لەسەر کرد ... وەك لە صەحیحی بوخاری و موسلیمدا هاتووە

**چوارەم:** ئەگەر ئەمە سابت بوو، ئەوە پێویستە بزانرێت کە (نەجاشی) پاشای (حەبەشە) حوکمی بە حوکمی خوای گەورە کردووە، واتە حوکمی بەوە کردووە کە خوای گەورە بۆ پێغەمبەری ناردووە (صلى الله عليه وسلم)، وە هەرکەسیش گومانی پێچەوانەی ئەمە ببات بەوە بڵێت (نەجاشی) حوکمی بە حوکمی خوای گەورە نەکردووە، ئەوە هیچ رێگا و مەجالێك نییە بۆ بە راست دانان و باوەڕ کردن و وەرگرتنی قسەکەی، مەگەر بە بەڵگە و بورهانی راست و دروست نەبێت، وە خوای گەورەش دەفەرموێت: ﴿قُلْ هَاتُوا بُرْهَانَكُمْ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ﴾. البقرة ١١١). واتە: پێیان بڵێ دە بەڵگەکانتان بهێنن ئەگەر راست دەکەن )).. وە هەموو ئەوانەشی چیرۆکی (نەجاشی) دەکەنە بەڵگە و، هەموو ئەو شتانەی کە باسی دەکەن لەبارەیەوە، بەڵگەن لەسەر یان نەك بەڵگەبن لەسەرمان، چونکە هەموو بەڵگەکان ئەوە دەسەلمێنن کە (نەجاشی) فەرمان رەوا و حاکم بووە بەوەی کە خوای گەورە ناردوویەتی لەو کاتەدا لەو حوکمانەی کە پێی گەیشتبوون، چونکە :

---

[٣٨] ) واتای ئایەتەکە بەم جۆرەیە:

(( هەرکە گوێیان لەو قورئانە دەبێت (واتە نەجاشی و ئەوانەی کە لەگەڵیدان) کە بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دابەزێنراوە، دەبینی فرمێسك لە چاویان دەرژێ و، دڵیان ترسی خوای لێ دەنیشێ و بە کوڵ دەگرین، چونکە لە ئاستی حەق و راستی چاك تێگەیشتوون، ئەوساش لەناخی دڵیانەوە دەڵێن: پەروەردگارمان... ئێمە باوەڕمان هێنا بەو قورئانەی ناردت، تۆش لەگەڵ شایەتاندا ناومان بۆ راستی و هەقیانەتی قورئان بنوسە و بمان کەرە ڕیزی ئوممەتی محمد (صلى الله عليه وسلم)، دەشڵێن: جا چیمانە باوەر بە یەکتاپەرستی خواو، بەو راستیەی لە قورئاندا هاتووە نەهێنین؟، بەتەماشین پەروەردگارمان لەگەڵ پیاو چاکاندا بمانباتە بەهەشت، ئینجا خوای گەورەش لە بەرامبەر ئەوقسەوە کردیان و پارانەوە: بەچەندان باخ و باخاتی بەهەشت، کە جۆگەو ڕوبارێکی زۆری لە (شیرو، هەنگوین و، عەرەق، و ئاو) بە خوڕ بە بەریاندا دەڕوات پاداشتی دانەوە، وە بۆ هەتا هەتاش تێیدا دەمێننەوە، ئەوەش پاداشتی هەموو چاکە کارەکانە، یان هەموو یەکتاپەرستەکانە، ئەوانەش کە نکوڵی یەکتاپەرستی یان کردوو باوەڕیان بە نیشانە و ئایەتەکانی ئێمە نەبوو، ئەوانە هاوەڵی ئاگری دۆزەخن )).

١-ئەوەی لەو کاتەدا لەسەر (نەجاشی) واجب بووە، شوێن کەوتنی ئەوە بووە کە خوای گەورە ناردویەتی و دایبەزاندووە، واتە: بەجێگەیاندن و شوێن کەوتنی یەکتاپەرستی (تەوحید) و، باوەڕ هێنان بە پێغەمبەرایەتی (محمد) صلى الله عليه وسلم، وە بەوەی کە عیسا بەندەو پێغەمبەری خوایە/ .... وە نەجاشی ئەمەشی کرد، کاتێك پەیامەکەی کە بۆ پێغەمبەری خوای (صلى الله عليه وسلم) ناردوو و ڕەوانە کرد .[39]

٢- وە هەروەها پەیمان (بەیعەت)ەکەی (نەجاشی) بە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و کۆچ کردن بۆلای، لەو کتێبەی کە باسمان کرد (نەجاشی) باسی ئەوە دەکات: ( کە خۆی و کورەکەی لەسەر دەستی (جەعفەر) و هاوەڵەکانی پەیمان (بەیعەت) یان داوە بە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و باوەڕیان هێنا بە خوای گەورە، وە هەروەها (نەجاشی) کورەکەی خۆی کە ناوی (أريحا بن الاصحم ابن حجر) بوو نارد بۆلای پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و، ڕایسپارد و پێی ووت کە بە پێغەمبەری خوا بڵێت: (إن شئت أن آتيك فعلت يا رسول الله، فإني أشهد أن ما تقول حق). واتە: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەگەر دەتەوێت بێم بۆلات ئەوە دێم، چونکە من شایەتی دەدەم و باوەڕم وایە، ئەوەی کە تۆ دەیڵێیت هەقە )). جا پێ دەچێت یان لەوانەیە (نەجاشی) ڕاستەوخۆ پاش ناردنی ئەم نامە و ڕاسپاردەیە مردبێت، یان پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەو کاتەدا ئەمەی لێ نەویستبێت، واتە نەی ویستبێت کە (نەجاشی) بچێت بۆلای، جا گشت ئەمانە هەمووی شتی نادیار و نا ئاشکران لە چیرۆکەکەدا، بۆیە بڕیار دان پێی لەسەر شتێك یان کردنی بە بەڵگە لەسەر شتێك بە بڕاوەیی دروست نییە، چ جای ئەوەی لە باسەکانی یەکتاپەرستی (تەوحید) و بنچینە (ئوصول)ی یەکانی دیندا بێت...

٣- وە هەروەها پشتگیری و سەرخستن و نوصرەتی (نەجاشی) بۆ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و دینەکەی و هاوەڵەکانی، ئەمەش کارێکی زۆر گەورە و گرنگ بوو، کە

[39] ) سەیری کتێبەکەی (سليمان الاشقر) بکە بە ناونیشانی (حكم المشاركه في الوزاره والمجالس النيابيه) کە لە (زاد المعاد)ەوە وەری گرتووە (ج/٣/ص٦٠)/ عمر الاشقر سالی (٢٠١٢) لە تەمەنی (٧٢)ساڵیدا مرد.

(نەجاشی) لە (حەبەشە) کۆچ بەر (موهاجیر)ەکانی سەرخست و لای خۆی گلی دانەوە و پاراستنی و ئەمن و ئاسایشی بۆ دابین کردن، و تەسلیم و رادەستی قورەیشی نەکردنەوە، وە نەشی هێشت یان رِێی نەدا بە (نەصارا) خاچ پەرستەکانی (حەبەشە) کە دەست درێژی بکەنە سەریان و ئازاریان بدەن، لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەوان (جەعفەر) و هاوەڵە کۆچ بەرەکان بە ئاشکرا بیرو باوەرو عەقیدەی خۆیان لەبارەی (عیسا)ەوە (علیه السلام) دەربەبرِی و بانگەوازیان بۆ دەکرد ...

وە بگرە جگە لە هەموو ئەمانەش لە کتێبەکەی (ئیبراهیم الاشقر)دا هاتووە دەڵێت: ((أنه (النجاشي) بعث بابنه و معه ستون رجلا من أهل الحبشة إلى النبي صلى الله عليه وسلم)). واته: نەجاشی کورِەکەی و (٦٠) پیاوی دیکەی لە ئەهلی (حەبەشە) نارد بۆلای پێغەمبەری خوا )). ئەمەش تەنها لەبەر سەرخستن و پشتگیری و شوێن کەوتنی پێغەمبەری خوا بوو (صلى الله عليه وسلم) .

وە لە فەرموودەیەکی (صەحیح)یشدا هاتووە کە بورەیدە لە باوکییەوە دەگێرِێتەوە: ((أن النجاشي أهدى لرسول الله صلى الله عليه وسلم خفين ساذجين أسودين فلبسهما)).[٤٠] واتە : لەو سەفەرەی کورەکەی (نەجاشی) پاشای حەبەشە بۆلای پێغەمبەری خوا (پاش ئەوەی باوەرِی هێنا) جوتێك خوفی رِەشی سادەی بە هەدیە نارد بۆ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ، کە ئەویش لەپێی کردن)).

لەگەڵ هەموو ئەم بەڵگانەشدا (عمر الاشقر) بە دەست و قاچەوە تێکەوتووە و، بانگەوازی ئەوە دەکات کە (نەجاشی) حوکمی بە شەریعەتی خوای گەورە نەکردووە، وە ئەمەش وەك زانیت درۆ و دەلەسە و بوهتانە بەدەم ئەو بەندە یەکتاپەرستەوە .

بەڵکو حەق ئەوەیە کە (نەجاشی) حوکمی بە شەریعەتی خوای گەورە کردووە لە هەموو ئەو شتانەی کە پێی گەیشتبوون لە شەرائیعەکانی ئایینی ئیسلام، وە هەرکەسیش پێچەوانەی ئەمە بڵێت هەرگیز باوەری پێ ناکرێت، تەنها بە بورهان و بەڵگەی راست و

[٤٠]) حسن صحيح : رواه ابن ماجة في كتاب اللباس – باب الخفاف السود برقم (٣٦٢٠) و حسنه الالبانى وقال حديث حسن .من طريق بريدة.

دروست و بڕاوه نەبێت، خۆ ئەگەر نا ئەوه له درۆزنەكانه و حسابی ئەوانی بۆ دەكرێت، خـوای گەوره‌ش دەفەرموێت: ﴿قُلْ هَاتُوا بُرْهَانَكُمْ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ﴾. البقرة ١١١). واتـه: پێیـان بڵـێ ده بەڵگەكانتان بهێنن ئەگەر ڕاست دەكەن )).

**چواره‌م:** بێ گومان وێنه و نمونه له چیرۆكی (نەجاشی) دا بۆ حاكم و فـەرمان ڕەوایەكـه كه هەر له بنەرەتدا كافر بووه و پاشان هەر له كارو مەنصەبەكەی خۆیدا بـووه كـه موسـوڵمان بووه، جا صدق و ڕاستگۆی و موسوڵمان بونەكەی دەرخستووه به تەسـلیم بـوون و ڕازی بـوونی تەواوەتی بۆ فەرمانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسـلم)، ئـەویش بـه نـاردنی كوڕەكـەی و پیاوانی قەومەكەی بۆلای پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، وه كوڕەكـەی بنێرێـت بـۆلای هەتا پێغەمبەری خوا ڕێگەی بدات (نەجاشـی) بـابی بچێت بـۆلای پێغەمبـەری خـوا (صلى الله عليه وسلم)، وه هەتا سەرخستن و پشت گیری و شوێن كـەوتنی خـۆی بـۆ پێغەمبـەری خـوا و دینەكەی دەربخـات و ئاشـكرا بكات، وه دژایـەتی و بەرائـەتی خـۆی بـۆ ئـایین و ڕێبـازی گـەل و باپیرانی دەربخات و ئاشكرا بكات، كه دژو پێچەوانەی بیرو باوەڕی ڕاست و هەق بوون ...

وه هەروەها هەوڵی ئەوه دەدات كه هەق جێبەجێ بكات و، فێـری ئـایین ببێت و، نزیـك ببێتەوه له بەرنامه و ئایینی ڕاست و دروست، وه هەر لەسەر ئەو بیرو باوەڕه بە خوای گـەوره بگات و بمرێت، ئەمانەش هەمووی پێش تەواو بوون و كامڵ بوونی شەریعەت و گەیشـتنی بـەو بوون به تەواوەتی ...

ئەمانه وێنه و باسه ڕاسـتەكانی ئـەم ڕووداوەن، كـه لـه دەقـەكانی قورئـان و فـەرموودە و ئەثەره ڕاست و صەحیحەكاندا باس كراوه و سابت و جێگیر بووه، وه ئێمه تەحەدا دەكەین كـه هەركـەس بێـت و وێنەیـەكی جیـاواز لەمـەمان بـۆ بسـەلمێنێت، وه هەركەسـێك شـتێك لـه پێچەوانەی ئەمه دەزانێت و پێی وایه ئەم شته بەم جۆره نییە، ئـەوه عـەرز و ئـەوه گـەس، با به بەڵگه و بورهـانی ڕاسـت و دروسـتەوه بێتـه پێشەوه، وه بۆمـان بسـەلمێنێت، نـەك بـۆ ئێمـه بەڵكو بۆ ئیمامی بوخاری و موسلیمیش بسەلمێنێ .... بەلآم به بەڵگه و بورهان نەك بـه قسـەو فەلسەفه لێدان...

ئەوەی دەكرێته بەڵگه و پێوەر و قیاس هێنانەوه لەسـەر ئـەم باسـه، بـێ گومـان قیـاس و پێوەرێكی پیس و جیاوازه، به ئەندازەی جیاوازی ئەرز و ئاسمانەكان، ئـەویش وێنـه و نمونـەی

کۆمەڵێکە لەخەڵکی کە خۆیان داوەتە پاڵ ئیسلام بەبێ ئەوەی خۆیان بەری بکەن لە دژو هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلام، بەڵکو خۆیان داوەتە پاڵ ئیسلام و لەهەمان کاتدا زۆر بە ئاشکرا و فەخرەوە خۆیان داوەتە پاڵ دژو هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلامیش، ئەوان هەرگیز خۆیان بەری نەکردووە و تەبەرایان نەکردووە لە دین و ئایینی (دیموکراسی)، وەك چۆن نەجاشی تەبەرای کرد لە دین و ئایینی مەسیحی (نەصرانی) یەت ...

نەخێر بەڵکو بگرە هێشتا ستایش و مەدحی دەکەن و بەشان و باڵیدا هەڵدەدەن و لە هەموو شوێنێکەوە بانگەوازی خەڵکی دەکەن بۆ چونە ناو ئەم دینە شیرکی و کوفری یەوە ... وە هەر لە خۆیان خوا و ئەرباب هەڵدەبژێرن و دەیکەنە سەرچاوەی شەریعەت و تەشریع لەسەر هەواو هەوەسی خۆیان بۆ خەڵکی دادەنێن ... وە بگرە لەگەڵ یان بەژدار دەبن لەو تەشریع و یاسا دانانە کوفری یە، کە بە گوێرەی بەندەکانی دەستوورە داڕێژراوە دانراوەکەی دەستی خۆیانە، وە زۆر سادەو ئاسان لەگەڵیان تێکەڵ دەبن و هاوبەشیان دەکەن لەسەر ئەو ئایینە کوفری یە، هەر لە ئەندام و وەزیرانیان و غەیری ئەوانی دیکەش ... وە زۆر سور و پێداگرن لەسەر ئەو شیرك و بێ باوەڕی یە، وە دوژمنایەتی ئەو کەسانەش دەکەن کە دژی دەوەستن و پێچەوانەی ڕەفتار دەکەن و هەوڵ دەدەن بۆ تێك دان و لەبن دەرهێنان و ڕوخاندنی ...وە هەموو ئەمانەش پاش تەواو بوون و کامڵ بوونی ئاین و، پێگەیشتنی قورئان و فەرموودە و بگرە (ئەثەر)ی شە....

جا توخوا ... بۆ خوا، ئایا ئەم قیاس کردنە ڕاستە ؟ کەسێك پاش کوفر و شیرك باوەڕ دەهێنێ و دەگەڕێتەوە بۆلای ئایینی ئیسلام و هەوڵی فێر بوون و گەیاندنی و جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی دەدات، پێش ئەوەی کە ئەو ئایینە کامڵ و تەواو بوبێت لەگەڵ ئەو کەسەی کە نەفس و هەوەس و شەهوەتی خۆی کردۆتە خواو شەریعەتی خۆی و خەڵکی؟ لە کاتێکدا شەریعەت کامڵ بووە و، قورئان و سوننەتی پێ گەیشتووە، ئایا ئەم دوو شتە کۆ دەکرێنەوە؟ ئایا ڕەوایە ئەم دوقیاسە کۆ بکرێنەوە ؟

**والله ما اجتمعا ولن يتلاقيا          حتى تشيب مفارق الغربان**

بەڵێ !! کۆدەبنەوە و یەکسانن، بەلأم لە میزان و تەرازوی هەق و ڕاستیدا نا ... بەڵکو لە میزان و شایەنی (مطففين)، ئەوانەی کە خوای گەورە چاویانی کوێر کردووە لە ئاست هەق و

راستيدا ... تەرازوو بازەكان ، هەر بۆيە كوێرانە دیندارى دەكەن بۆ دينى ديموكراسى و هەڵوەشێنەرەوەى ڕێباز و ميلەتى يەكتاپەرستى ....

﴿وَيْلٌ لِلْمُطَفِّفِينَ * الَّذِينَ إِذَا اكْتَالُوا عَلَى النَّاسِ يَسْتَوْفُونَ * وَإِذَا كَالُوهُمْ أَوْ وَزَنُوهُمْ يُخْسِرُونَ * أَلَا يَظُنُّ أُولَئِكَ أَنَّهُمْ مَبْعُوثُونَ * لِيَوْمٍ عَظِيمٍ * يَوْمَ يَقُومُ النَّاسُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ سورة المطففين (١-٦).

## گومانى سێيەم:
## (تَسمِيَةُ الديمُقراطِيَة بِالشُورى)
## ناو بردنى (ديموكراسى) به ڕاوێژ و شورا (الشورى)

ئەمەش بەهەمان جۆر وەك گومانەكانى چيرۆكى پێغەمبەر (يوسف) و چيرۆكى پاشاى حەبەشە كە ناوى (نەجاشى) بوو، كرايە ناو يارى و گاڵتە بازى يەكانى هەڵگەراوە كان لەدينى ئيسلام بۆ دينى ديموكراسى، هەتا هەندێك لە عەمامە بەسەرە چڵكاو خۆرەكان، لەسەر منارەى مزگەوتەكانەوە هاوار يان كردووە بۆ ئەم شوبهە بەتاڵە، وە لە نوێژى جومعەدا و لە (خيرالايام)دا وتويانە: (دەبێت بە سورەتى الشورى بگوترێت پەرلەمان). والعياذوا باللە، ئەو سورەتەى كە خواى گەورە بۆ بەندە پاك و يەكتاپەرستەكانى خۆى نارد، ئێستە بەندە پيس و موشريكەكانى شەيتان خۆيان كردووە بە خاوەنى...

بۆيە سەير نەبێت لامان ئەگەر عەمامە بەسەرێكى مورتەد بڵێت: خواى گەورە بە پێغەمبەرى (صلى الله عليه وسلم) فەرمووە ﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ﴾. وە دەفەرموێت: ﴿وَشَاوِرْهُمْ فِي الْأَمْرِ﴾. ئەم ئايەتانە مەبەست پێى لە پەرلەمانە... يان ئەم ئايەتانە پەرلەمانيش دەگرێتەوە، چونكە ئەويش هەر شوراو مەشوەرەتە ... ئيتر بەم جۆرە (ديموكراسى) يان ناو ناوە بە (شورى)، بۆ تێكەڵ كردنى ئەم زاراوە شەرعى يە بەم مەزهەب و ڕێچكە كوفرى و بێ باوەڕى يە، هەتا دوايش سەر لەو خەڵكە نەزان و داماوە بشێوێنن و بيان كەنە پليكانەى قادرمەى سەركەوتنى خۆيان بەسەرياندا ...

## ئێمەش بە تەوفیقی خوای گەورە پێیان دەڵێین:

**یەکەم:** گۆڕینی زاراوە و ناوەکان هیچ بایەخێکی نییە، مادەم راستی و شتەکان هەر وەك خۆیان بن و نەگۆڕابن ... جا هەندێك لەو حیزب و دەستانەی کە بەندایەتی بۆ دیموکراسی دەکەن، بانگەوازی ئەوە دەکەن گوایە ئەوان بۆیە بانگەشە بۆ دیموکراسی دەکەن و کاری لەسەر دەکەن، مەبەستیان پێی ئازادی را دەر برین و قسە کردن و بانگەوازە، وەك خۆیان دەڵێن لەبەر بەرژەوەندی و مەصلەحەتی دەعوە!..[41] لەم جۆرە فڵتانە .

پێیان دەڵێین: گرنگ نییە ئێوە چی ناوەنێن و چۆن لێی تێدەگەن و چۆن دەیشەرعێنن ... بەڵکو گرنگ ئەوەیە کە ئەو (دیموکراسی)یە چییە کە حاکمە (طاغوت)ەکان جێبەجێی دەکەن و بانگەوازی ئێوەی بۆ دەکەن، بۆ بەژداری کردنی و ئەنجام دانی دەنگ دان (ئینتخابات) لە پێناویدا و، وە یاسا و تەشریع دانان و فەرمان رەوایی کە ئێوە بەشداری تێدادەکەن بەگوێرەی ئەو دەبێت؟؟؟ جا ئەگەر بە خەڵکی پێکەنین و فێڵتان لێ کردن، ئەوە هەرگیز ناتوانن ئەمە لەگەڵ خوای گەورە بکەن، ﴿إِنَّ الْمُنَافِقِينَ يُخَادِعُونَ اللهَّ وَهُوَ خَادِعُهُمْ﴾. االنساء ١٤٢). واتە: بەراستی دوو ڕووەکان (مونافیقەکان) دەیانەوێت خوای گەورە هەڵبخەڵەتێنن، کەچی نازانن خوای گەوری هەڵخەڵەتێنەری ئەوانە )).[42] وە ﴿يُخَادِعُونَ اللهَّ

---

[41] ) وە بێ گومان ئەو ئازادی رادەربرین و وشەیە کە دیموکراسی دەیەوێت و دایناوە، ئازادییەکی باتڵی بێ باوەرییە، چونکە کاتێك دیندارانی دیموکراسی خوازی بانگەوازی دیموکراسی و ئازادی رادەربرین دەکەن، مەبەستیان پێی ئازادی درکاندنی فەرمان و وتەی خوای گەورە نییە بە تەنها ، بەڵکو مەبەستی سەرەکی و بنچینەییان ئازادی قسەو گوفتاری طاغوت و کافرو و مولحید و موشریکەکان و ئازادی دەربرینی بیرو باوەری هەڵگەرانەوە لە دین و جنێو دان و تەعن دانە لە هەموو موقەدەساتەکان، ئەم کوفر و بێ باوەری یەش لەوانەیە جێبەجێ کرابێت بە ئاشکرا لە وڵاتانی ڕۆژئاوا (غەرب) ، بەلاَم دیموکراسی یەتی وڵاتە عەرەبی یەکان ئەوە تەنها ئازادی گشت کوفر و ئیلحاد و زەندیقەیەکی تێدایە ، واتە تەنها ئازادی یە بۆ ئەو کارانە، وە ئیسلامیش لایان کۆت و زنجیر کراوە و دوور خراوەتەوە، وە ئەم بانگ خوازانەش گەورەترین هیواو ئاواتیان ئەوەیە کە خەڵکی بگەیەننە ئەو دیموکراسی یەی ڕۆژئاوای بێ باوەری یە و جێبەجێی بکەن، وە کوفریش یەك میلەتە، وە پلە پلەشە ، جا ئاگاداربە .

[42] ) تیبینی: جیاوازی هەیە لە نێوان زانایاندا، لە بارەی مەبەست لە وشەی (خدع) هەندێك لە موفەسرین بۆ ئەوە چوون کە دوو روەکان وا دەزانن بەوەی نوێژ دەکەن و هەندێك لە فەرائیزەکانی ئیسلام جێبەجێ دەکەن، ئیتر خوێن و ماڵی خۆیان دەپارێزن لە شمشێری ئیسلام، وە دەیانەوێن بە روالَەتی موسوڵمانەکان فریو بدەن، نازانن کە خوای گەورە ئەم حوکمەی بۆ فریو دانی ئەوان داناوە، واتە هەتا هەڵیان بگرێت بۆ سزای دوا رۆژ، هەندێکی دیکەش

وَالَّذِينَ آمَنُوا وَمَا يَخْدَعُونَ إِلَّا أَنْفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ﴾ البقرة٩) واته: دوو ڕووەكان بەلای خۆيانەوە و بەحسابی خۆيان خوای گەورە و بەندە ئيمان دارەكانی فريو دەدەن و هەڵيان دەخەڵەتێنن، بەلاَم نازانن و بێ شعورن بەرامبەر ئەوەی كە تەنها خۆيان فريو دەدەن و خۆيان هەڵدەخەڵەتێنن )).

جا گۆڕينی ناوی شتەكان، بڕيارو حوكمەكان ناگۆڕێت، وە حەرامێك حەلاڵ ناكات، يان حەلاڵێك حەرام بكات، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: ((لتستحلن طائفة من أمتي الخمر باسم يسمونها إياه)).[٤٣] واته: بێ گومان كۆمەڵێك لە ئوممەتی من، مەی حەلاڵ دەكەن بە ناوی ديكەوە )). يان مەشروب حەلاڵ دەكەن بە ناوی ديكەوە)).

لەگەڵ ئەمەدا زانايان ئەو كەسەيان كافر كردووە كە جنێو دەدات بە يەكتاپەرستی (التوحيد)، يان دژايەتی بكات، وە ناويان لێ ناون بە لەدين دەرچووەكان يان بێ باوەڕەكان، وە هەروەها ئەوەشيان كافر كردووە كە شيرك بە چاك دەزانێ و بانگەشەی بۆ دەكات و كاری پێ دەكات و ناوی تری لێ دەنێت، واتە شيرك دەكات لە ژێر ناونيشانی كاری ديكەدا ...[٤٤]/ وەك ئەوانە دەيكەن، دينی شيرك و بێ باوەڕی (ديموكراسی)يان ناو ناوە بە (الشورى) ... بۆ ڕێگە پێدانی و ڕازاندنەوەی و بانگەشە كردنی خەڵكی بۆ چونە ناوی ... فبُعداً بعداً.

**دووەم:** قياس كردن و چواندنی (ديموكراسی) موشريكەكان لەسەر (شورا)ی يەكتاپەرستان و، چواندنی (ئەنجومەنی شورا) بە ئەنجومەنەكانی كوفر و فسوق و تاوان و عصيان، قياس و چواندنێكی سەقەت و باتڵ و بەتاڵە، چونكە تۆ پێشتر زانيت و بۆت ڕوون بوويەوە كە (ئەنجومەنی گەل يان نيشتمان) يان پەرلەمان مۆڵگە و پێگەيەكە لە مۆڵگە و پێگەكانی بت پەرستی و وەثەنی يەت، و كۆشك و سەرچاوەيەكی ديارى شيركە، كە خوا

---

بۆ ئەوە چوون كە خوای گەورە لە ڕۆژی دوواييدا نور و ڕوناكييەك دەدات بە دوو ڕوەكان وەك باوەڕ دارەكان، بەلاَم كاتێك دەگەن بە پردی سيرات دەكوژێتەوە، ڕەنگە والله اعلم مەبەست ئەمە بێت ... ئيتر دەڵێن (انظرونا نقتبس من نوركم ».الحديد: ١٣)سەدی.

[٤٣] ) صحيح: رواه الامام احمد في مسنده عن عبادة بن صامت رضي الله عنه برقم (٢٢٧٠٤) و رواه ابي داود ، وصححه الالباني رحمه الله في سلسلة الصحيحة وصحيح الترغيب والترهيب، وغاية المرام برقم (٩٠) وقال حديث صحيح ...

[٤٤] ) سەيری (الدرر السنية في أجوبة النجدية) بكە (ج/١ص١٤٥).

(ئـەرباب)ە كـانى ديموكراسـى يـەكانى تێـدا كۆبۆتـەوە، وە خـوا و پـەروەردگارە لـە يـەكتر جياوازەكـانى تێـدا كۆبۆتـەوە، و شـەريعەت و ياسا دادەنـێن لـە ئاينـدا و لەسـەر بنـەماو ياسـا دەستورى يە زەمينى يە دەستكردەكەياندا..[45]، خواى گەورە دەفـەرموێت: ﴿يَا صَاحِبَيِ السِّجْنِ أَأَرْبَابٌ مُتَفَرِّقُونَ خَيْرٌ أَمِ اللهُ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ * مَا تَعْبُدُونَ مِنْ دُونِهِ إِلَّا أَسْمَاءً سَمَّيْتُمُوهَا أَنْتُمْ وَآبَاؤُكُمْ مَا أَنْزَلَ اللهُ بِهَا مِنْ سُلْطَانٍ إِنِ الْحُكْمُ إِلَّا للهِ أَمَرَ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا إِيَّاهُ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾ سورةتى يوسف ٣٩-٤٠).

واته: ئەى هەردوو هاوڕێى بەنديخانەكەم: ئاخۆ چەند خوايەكى جيا جيا (موتەفـەريق) بپەرسـتڕێن چاكترە، يـان هـەر يـەك خـواى تـاك و تـەنها و زاڵ و بـە دەسـەلآت بەسـەر هـەموو شـتێكدا ؟؟ ئـەوەش چـاك بـزانن ئەوانـەى ئێـوە لـە جێگـەى خـوا دەيـان پەرسـتن تـەنها چـەند ناوێكى بێ ناوەڕۆكن، ئێوە و باو و باپيرانتان بە ئارەزووى خۆتان ناوتـان نـاون و كردوتـانن بـە خوا/ وە خواى گەورە هيچ بەلگەيەكى بۆ ڕاستى پەرستنى ئەوانە نەناردووە، وە هەموو حـوكم و بڕيارێك تەنها و تەنها هەر هى خوايە، وە دەبێت تـەنها هـەر ئـەو حـاكم و بڕيـار بەدەسـت بێـت، وە فـەرمانى داوە كـە: ئێـوە دەبێـت تـەنها بەندايـەتى بـۆ ئـەو بكـەن و ئـەو بپەرسـتن و گوێڕايـەڵى ئـەو بكـەن، نـەك لـە حيـزب و عەشـيرەت و گـروپ و خێـڵ ....، هـەر ئـەو ئاينـە (يەكتاپەرسـتى) ڕاسـت و ڕەواو پايـە دارە، كـە پـێم ڕاگەيانـدى و بانگـەوازم بـۆ كـردى، بـەلآم زۆربەى خەڵكى نازانن كە ئايينى يەكتاپەرستى (تەوحيد) ڕاست و ڕەوا يە )).

---

[45] ) وەك لە مادەى (٦١) لە ڕەشنوسى هەميشەيى دەستورى عێراقدا هاتووە: (( ئەنجومەنى نوێنەران ئەم كارانەى لە ئەستۆ دايە: ١. دانانى ياسا فيدراڵيەكان)، هەروەها لە مادەى (٧٣)دا هاتووە: (( سەرۆك كۆمار ئەم دەسەلآتانەى خوارەوەى هەيە: ١.،٢.، ٣. پەسەند كردن و دەركردنى ئەو ياساو تەشريعانەى ئەنجومەنى نوێنەران دايدەنێن، تەشريع و ياساكانيش بە پەسەند كراو دەزانرێن پاش (١٥) تێپەر بوونيان بەسەر ناردنيان بۆ سەرۆك كۆمار )). وە مادەى (٤٠) لە پرۆژە دەستورى هەرێمى كوردستاندا هاتووە: (( پەرلەمانى كوردستانى عێراق دەسەلآتى ياسا و تەشريع دانان و سەرچاوەى بريار دانە لەسەر پرسە چارە نووس سازەكانى هەرێمى كوردستان))، وە لە مادەى (٥٣) دا هاتووە: (( پەرلەمان بێجگە ئەو ئەركانەى بە پێى ياسا كار پێكراوەكانى هەرێم پێى دەسپێر درێن، ئەم ئەركانەشى لەسەر شانە: ١.دانانى تەشريع و ياسا لە هەرێمى كوردستان )). وە هەروەها لە مادەى (٥٤) دا هاتووە: بەدەر لەو حوكمى برگەى (٧)ەمى مادەى (٦٥) كە لەم دەستورەدا هاتووە، پەرلەمان بۆى نييە واز لە دەسەلآتى ياسادانان و تەشريعى خۆى بهێنێت )).

هەروەها دەفەرمویێت: ﴿ أَمْ لَهُمْ شُرَكَاءُ شَرَعُوا لَهُمْ مِنَ الدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنْ بِهِ اللَّهُ وَلَوْلَا كَلِمَةُ الْفَصْلِ لَقُضِيَ بَيْنَهُمْ ﴾ الشورى ٢١). واتـە: ئـاخۆ ئـەو موشـریکانە (ئـەبو جـەهل و شـوێن کەوتوەکانی) چەند خوایەکی هاوبەشیان هەیە، کە بەرنامە و شەریعەتیان بۆ دادەنـێن، لـەوەی کە بۆیان نییە بیکەن و خوای تاك و تەنها ڕێگری لێ کردوون، ئەگەر بەڵێنی خوا نەبووایە بـە دواخستنی سزا بۆ ڕۆژی دوایی، هەر زوو بڕیار درابوو لـە نێوان ئـەوان و ئیمـان دارەکانـدا، بـە لەناو بردن و غەزەبی خوای گەورە بەسەر بێ ئیمان و موشریکەکاندا )).

جا قیـاس کردنـی شـورا بـە پەرلـەمان، قیـاس کردنـی شـیرکە بەسـەر یەکتاپەرسـتی و تەوحیددا، وە ئیمان و بیرو باوەرە بەسەر کوفرو بێ باوەریدا ...وە قسە کردنە بە نـاوی خوای گەورەوە بەبێ عیلم و زانست، بوختـان کردنـە بـەدەم دینەکەیـەوە و درۆکردنـە بەسـەر خـوای گەورە وە، وە بێ باوەر بوون و دژایەتی کردن و نکوڵی کردنـی فـەرموودەکانی خوای گـەورە و شێواندنی هەقە بەسەر ناهەقیدا بە درۆو و باتڵ و، تاریکی بەسەر نوور و ڕووناکیدا .

ئەگەر ئەمە ڕوون بوویەوە، با بەندەی موسـوڵمان چاك بزانێـت، کـە جیـاوازی و فـەرقی ئاشکراو جەلی هەیە لە نێوان، ئەو (شورا)یەی کە خـوای گـەورە دایـناوە بـۆ بەنـدەکانی، لەگەڵ ئـەو (دیموکراسـی)یە دەسـت کـردەی مرۆڤـەکان، وەك جیـاوازی نێـوان ئـەرز و ئاسمانـەکان ... بەڵکو زۆر لەم جیاوازییە گەورەتر و وەك جیـاوازی نێـوان بـەدی هێنـەر و بـەدی هێنـراو، یـان خالق و مەخلوق ، چونکە:

- ☐ شورا، ڕێباز و مەنهەج و نیزامێکی ڕەبانیی خواییە، بەڵام دیموکراسـی لـە دروسـت کـراوی ئـەو مرۆڤـە کـەم و کورتانەیـە، کـە شـەهوەت و هـەواو ئارەزوویـان سـەر و فیطـرەتـی لـێ تێکداون ...
- ☐ شـورا، لـە شـەریعەت و دیـن و حیکمـەتی خـوای گەورەیـە، بـەڵام دیموکراسـی کوفرو بـێ ئیمـانی یـە بـە شـەریعەت و دینـی خـوای گـەورە، وە هەڵوەشـێنەری حـوکم و بڕیـارە کانیەتی....
- ☐ وە شورا بۆ ئەو شتانە دەکرێت کە نەص و دەقی ئایەتی لەسەر نییە، بەڵام کـاتی بـوونی نەص و دەقی ئایەت ئـەوە شـورا ناکرێـت، خـوای گـەورە دەفـەرمویێت: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا

مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْرًا أَنْ يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ وَمَنْ يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا مُبِينًا﴾ ألاحزاب ٣٦). واته: بۆ هیچ پیاو و ئافرەتێکی باوەر دار نییه، کاتێك خواو پێغەمبەرەکەی (صلى الله عليه وسلم) ، بڕیاری هەر کارێکیان دا، بۆیان نییه سەرپشك بن لە کارەکەیاندا، وە هەرکەسیش سەرپێچی فەرمانی خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی بکات، ئەوە ڕێگەی راست و هیدایەت وون دەکات و سەر لێ شێواو دەبێت))./ بەلآم دیموکراسی بریتیە لە سوکایەتی و گەمە کردن و گاڵتە بازی بە هەموو شتێك و لە هەموو دەرگایەکەوە بە شەریعەت، وە فەرمان و حوکمەکانی خوای گەورە هیچ بایەخ و حساب و ئیعتبارێکی بۆ ناکرێت، بەڵکو ئەوەی بایەخ و ئیعتباری بۆ دەکرێت، بە تەواوی مەعنا لە ئایینی (دیموکراسی)دا تەنها و تەنها لە حوکم و بڕیارو شەریعەت و دەسەلآتی گەل و میلەتە لە هەم و مەجال و کارو بارێکدا..[٤٦] ، هەروەك لە دەستووره نوسراوەکانیاندا هاتووە و نوسراوە و دەڵێن: ((ألامة مصدر السلطات جميعا)). واته: گەل سەرچاوەی هەموو دەسەلآتەکانه )). یان دەڵێن: ((التشريع هو وظيفة الاولى للبرلمان )). واته دانانی تەشریع و یاسا یەکەم فەرمان و کاری پەرلەمانه)).

- ديموكراسی گەل بە بەرزترین دەسەلآت دەزانێت لە بوندا، کە بریتیە لە بڕیاری زۆرینەی گەل، وە تەشریعی زۆرینە وە دین و ئایینی زۆرینە، واتە زۆرینە چی بێت و بیەوێت شەریعەت و دین ئەوە دەبێت، زۆرینە حەلآڵ دادەنێت و حەرام دادەنێت، واتە حەلآڵ و حەرام بەدەست زۆرینەیە، وە زۆرینە خواو پەروەردگارە لە دیموکراسیدا ... بەلآم لە شورادا گەل یان زۆرینە پەیوەستە و فەرمان پێکراوە بە سەمع و تاعەو گوێڕایەڵی بۆ خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی و ئەمیرو پێشەوای موسوڵمانان، وە ئیمام پەیوەست نابێت بە دەنگ و رای زۆرینەوە و حوکم و بڕیارەکانی، بەڵکو بە پێچەوانەوە

---

[٤٦] ) ئەمەش بێ گومان لە دیموکراسی رۆژئاوا (غەربدا)، بەلآم لە دیموکراسی ولآتی خۆمان و عەرەبی بێ باوەر، بایەخ و ئیعتباری یەکەم و ئاخیر، سەرەتاو کۆتایی، تەنها بۆ پاشا یان ئەمیر یان سەرۆکە، چونکە بەبێ رازی بوونی ئەو قسەو گوفتاری گەل و نوێنەرەکانی و ئەنجومەنەکەی هیچ قیمەت و بەهایەکی نییه، هەمووی هەر بەدەستی ئەوە، چۆن بیەوێت و کەی بیەوێت دەیبەستێتەوە و هەڵی دەوەشێنێتەوە و یاری پێ دەکات بە کەیفی خۆی ...

زۆرینــه فــەرمان پێكــراون بــه گوێڕایــەڵی و ســەمع و تاعــە بــۆ ئــەمیر یــان پێشــەوای موسوڵمانان، ئەگەر ستەم كارو جائیریش بن، مادەم فەرمان نەكەن بە تاوان و بێ فـەرمانی خوای گەورە...[47]

- ☐ دیموكراسی شایەن و میزان و خواكەی تەنها زۆرینەیە، وە هەر ئەو سەرچاوەی تەواوی دەسەلاتەكانە ... بەلام له (شورا)ی ئیسلامدا زۆرینه هیچ شایەن و تەرازو و شوێنەوارێكی نییه، بەڵكو خوای گەوره له قورئاندا فەرمان و حوكمی داوه بەسەر زۆرینەدا به حوكم و فەرمانێكی زۆر ئاشكراو دەفەرموێت: ﴿ وَإِنْ تُطِعْ أَكْثَرَ مَنْ فِي الْأَرْضِ يُضِلُّوكَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ إِنْ يَتَّبِعُونَ إِلَّا الظَّنَّ وَإِنْ هُمْ إِلَّا يَخْرُصُونَ ﴾.ألأنعام ١١٦). واته: ئەی محمد (صلى الله عليه وسلم) ئاگاداربه، ئەگەر تۆ گوێڕایەڵی زۆربەی ئەوانه بكەیت كه لەزەویدان، ئەوە له ڕێگەی خوای گەوره (هەق) گومرات دەكەن و لات دەدەن، چونكه ئەوانه تەنها شوێن گومان كەوتوون و، هەمیشە درۆو ساختەكاری دەكەن )).

هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَمَا أَكْثَرُ النَّاسِ وَلَوْ حَرَصْتَ بِمُؤْمِنِينَ﴾یوسف ١٠٣). واتـه: ئـەی محمـد (صـلى الله علیـه وسـلم) زۆربـەی خـەڵكی نابنـه ئیمـان دارو پشـت لـه ئیمـان دەكـەن، هەرچەنده ئەگەر تۆش سووربیت لەسەر ئیمان هێنان یان )).

وه دەفـەرموێت: ﴿وَإِنَّ كَثِيرًا مِنَ النَّاسِ بِلِقَاءِ رَبِّهِمْ لَكَافِرُونَ﴾. الـروم٨). واتـه: زۆربـەی خەڵكی ئیمان یان نییه بەوەی دەگەنەوه به خـوای گـەوره، واتـه زۆربـەی خـەڵكی باوەڕیـان بـه ڕۆژی دوایی و زیندو بوونەوه نییه )).

---

[47] ) ئاگاداربه ... ئەمه بۆ پێشەواو ئەئیمه و فەرمان ڕەوای موسوڵمانان كه حوكم به شەریعەتی خوای گەوره دەكەن، و دوژمنایەتی دوژمنانی خوای گەوره دەكەن، نەك بۆ سوك و ڕسواترین و سەفیه ترینی خەڵكی له فەرمان ڕەوا كافر مورتەدەكان، پشتیوان و ئەولیاكانی یەهودو نەصارا ... جا دووباره ئاگاداربه !.

وه دەفەرمویێت: ﴿وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُمْ بِاللَّهِ إِلَّا وَهُمْ مُشْرِكُونَ﴾. يوسف١٠٦) واتە: زۆربەی خەڵكی یان ئەهلی كیتاب باوەڕ ناهێنن بە خوای گەورە، ئیلا لەو كاتەدا شەریك دادەنێن بۆ خوای گەورە )).

وه دەفەرمویێت: ﴿وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَشْكُرُونَ﴾ البقرة٢٤٣).واتە: بەلاَم زۆربەی خەڵكی سوپاس و شوكری خوای گەورە ناكەن )).

وه دەفەرمویێت: ﴿وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يُؤْمِنُونَ﴾.يوسف٢١). واتە: وه زۆربەی خەڵكی ئیمان بە خوای تاك و تەنها ناهێنن و بێ ئیمانن )).

وه دەفەرمویێت: ﴿وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾ألإسراء٨٩). واتە: وه زۆربەی خەڵكی نەزانن )).

وه دەفەرمویێت: ﴿فَأَبَى أَكْثَرُ النَّاسِ إِلَّا كُفُورًا﴾ يوسف٤٠) واتە: زۆربەی خەڵكی جگە لە سپڵەیی و بێ باوەڕی هیچی تریان ناوێت )).

ئەمە لە وتەو فەرمایشتی خوای گەورەیەو لەم بارەوە لە قورئاندا زۆر هاتووە، وەهەروەها پێغەمبەری خوایش (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمویێت: ((إنما الناس كإبل مائة لا تكاد تجد فيها راحلة)).[48] واتە: بێگومان خەڵكی وەك سەد (١٠٠) ڕەوە وشتر وان، زۆر بە گرانی و دەگمەن وشترێكی سواریان تێدا دەدۆزیتەوە )). ئیمامی بوخاری و موسلم لە عبداللە ی كوری عومەرەوە ریوایەتیان كردووە، خوای گەورە لە هەموویان رازی بێت، وە هەروەها لە صەحیحی بوخاریدا ئەبو سەعیدی خودری رەزای خوای لێ بێت لە پێغەمبەری خوداوە (صلى الله عليه وسلم) دەگێڕێتەوە فەرموویەتی: (( يقول الله تعالى يا آدم فيقول لبيك وسعديك والخير في يديك فيقول أخرج بعث النار قال وما بعث النار قال من كل ألف تسعمائة وتسعة وتسعين فعندها يشيب الصغير (وتضع كل ذات حمل حملها وترى الناس سكارى وما هم بسكارى ولكن

[48] ) متفق عليه: رواه البخاري ومسلم، وغيرهما من حديث عبدالله بن عمر رضي الله عنهما .

**ڕوونكردنەوە:** دیارە لای عەرەب وشتر دوو جۆرە، جۆرێكیان ئەوەیە كە بەكاردرێت بۆ راحیلە، واتە بۆ سواری، كە ئەمە لای ئەوان زۆر بە نرخە، وە جۆرێكی تریشیان كە بەكارنایەت بۆ راحیلە، ئەمەش تەنها ئەدەن لە ملی و ئەی كەن بە قوربانی، جا ئاگادارەبە لە مەبەستەكەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) !

عذاب الله شديد).. )).[49] واته: خوای گەوره دەفەرموێت: ئەی ئادەم، ئادەم دەڵێت: (**لبيك وسعديك والخير في يديك**)، خوای گەوره دەفەرموێت: ئادەی ناردەی ئاگر دەربهێنه، وتی : ناردەی ئاگر چییه؟ خوای گەوره فەرمووی: لەهەر هەزارێك نۆسەدو نەوەدو نۆ)، ئالەو كاتەدا بچوك پیردەبێت، وه هەموو دووگیانێكیش كۆرپەكەی دادەنێت و لەباری دەچێت، وه خەڵكیش دەبینیت وەك سەرخۆشن، بەڵام له ڕاستیدا سەرخۆش نین، بەڵكو سزای خوای گەوره زۆر سەخت و سامناكه)).[50] ئەم شەریعەت و بەرنامەی خواو دینی خوایه، كه به ئاشكرا گومڕایی و سەر لێ شێواوی و لادانی زۆرینه ڕوون دەكاتەوه، هەر بۆیه خوای گەوره بڕیار دەدات و دەفەرموێت: ﴿إِنِ الْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ﴾ سورةتی یوسف ٣٩-٤٠).واته: هەموو حوكم و بڕیارێك تەنها و تەنها هەر هی خوایه، وه دەبێت تەنها هەر ئەو حاكم و بڕیار بەدەست بێت )).

بۆیه دیموكراسی لادانەو شوێن كەووتوان و بانگ خوازانی دیموكراسی قایل نابن و، ئامادە نین ملكەچ بن و ڕازی بن به حوكمی خوای گەوره و شەریعەتەكەی، وه بگرە عینادی و نكولی دەكەن و دەڵێن: (( إنِ الحُكمُ إلا لِلأكثرِيَة )). واته: حوكم و دەسەڵات تەنها بۆ زۆرینەیه)). جا خەجاڵەتی و تیاچوون و دووریی بۆ ئەوانەی شوێنیان دەكەون و، لەسەر ڕێگه و ڕێگاكەیان دەڕۆن و بەسەر دیموكراسی یه كوفری یەكەیاندا پێ هەڵدەنێن، هەرچەند ڕیشی درێژ بێت و پۆشاكەكەی كورت بێت ... هەر لەم دونیادا پێیان دەڵێین بەڵكو تەوبە بكەن و بگەڕێنەوه بۆیان چاكترە و ئاسان ترە لەسەر یان، لەوەی لەو ڕۆژە گەورەدا بیبیستن و پێیان بووترێت، كه هەموو خەڵكی دەوەستێنرێن و كۆدەكرێنەوه بۆ خوای جیهانەكان، جا دەیانەوێت بچن بۆ حەوزی (كەوثەر) بۆلای پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، بەلام

---

[49] ) تەواوی فەرموودەكه بەم جۆرەیه:

يقول الله تعالى يا آدم فيقول لبيك وسعديك والخير في يديك فيقول أخرج بعث النار قال وما بعث النار قال من كل ألف تسعمائة وتسعة وتسعين فعندها يشيب الصغير { وتضع كل ذات حمل حملها وترى الناس سكارى وما هم بسكارى ولكن عذاب الله شديد } قالوا يا رسول الله وأينا ذلك الواحد قال أبشروا فإن منكم رجلا ومن يأجوج ومأجوج ألف والذي نفسي بيده أرجو أن تكونوا ربع أهل الجنة أرجو أن تكونوا ثلث أهل الجنة أرجو أن تكونوا نصف أهل الجنة ما أنتم في الناس إلا كالشعرة السوداء في جلد ثور أبيض أو كشعرة بيضاء في جلد ثور أسود أو كالرقمة في ذراع الحمار .

تخريج السيوطي : (حم ن) عن أبي سعيد.

تحقيق الألباني : (صحيح) انظر حديث رقم: ٨١٤٢ في صحيح الجامع.

[50] ) واته له هەزار (١٠٠٠)كەس خوای گەوره (٩٩٩)ی دەنێرێت بۆ دۆزەخ. / خوای گەوره پەنامان بدات.

فريشتەكانى خواى گەورە ڕێيان لێ دەگرن و دەوترێت: إِنَهُم بَدَلوا وَ غَيَروا، فيقولها ألنبي صلى الله عليه وسلم: (( سُحقاً سُحقاً لِمَن بَدَلَ بَعدِي )).[51] واتە: ئەوانە گۆڕييان، جا پێغەمبەرى خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمويێت: دوورى، دوورى بۆ ئەوەى لە دواى من گۆڕى )).[52]

بەم شێوەيە (ديموكراسى) ئەساس و بنەماكەى لە خۆڵ و خاكى كوفر و بێ باوەرى ئيلحادەوە سەرى هەڵداو، لەسەر چاوەكانى شيرك و فەسادى ئەوروپا گەورەبوو، ئەو كاتەى كە دين يان لە ژيان جيا كردەوە، وە ئەم دەستەواژە لە ناو ئەو كەش و هەوا دروست بوو و سەرى هەڵدا، كە هەموو ژەهرو فەساد و ناڕەوايى يەكى هەڵگرتووە و، كە ڕەگەكەى هيچ پەيوەنديیەكى نەماوە بە خاكى ئيمان و باوەرەوە، يان ئاودانى بيرو باوەرو چاكەوە ... وە لە خاك و جيهانى رۆژ ئاوادا هەرگيز نەى توانى خۆى بسەپێنێ ئيلا دواى جياكردنەوەى دين نەبێت لە دەوڵەت، واتە هەتا ئەو كاتەى دين يان لە دەوڵەت و دەسەلآت جياكردەوە، جا پاش ئەوە ئيتر نێر بازى (لواط) و زينا و خواردنەوەى عەرەق و، تێكەڵاو كردنى ڕەگەزو خزمايەتى و، و جگە ئەمانەش لە خراپە و فاحيشەكانى ديكە، لەوەى ديارە و لەوەى ناديارە بۆى حەلآڵ كردن ...

جا ئيتر پاش ئەمە هيچ كەس مشت و مرو ستايشى ديموكراسى ناكات و، نايچوێنێت بە (شورا)، تەنها دووان نەبێت كە سێهەميان نييە، يان ديموكراسى يەكى كافرو بێ دين، يان سوك و ڕسوايەكى نەزان بەماناو ناوەڕۆكەكەى ...

وە ئێستاش زەمانێك تێكەوتووين كە دەستەواژەكان بەسەر يەكدا تێكەڵ و پێكەڵ بووە و، هەموو شتە دژ بەيەكەكانى تێدا كۆبۆتەوە، خۆ پێمان سەير نەبێت زۆرێك لە پشتيوانان و شوێن كەوتوانى شەيتان بەسەر شان وباڵى ئەم مەزهەب و ڕێچكە كوفرى و بێ باوەرى يەدا هەڵبەن، بەڵكو سەير لەوەدايە ئەوانەى كە خۆيان داوەتە پاڵ ئيسلام و بانگەوازى ئيسلام دەكەن، بەشان وباڵيدا هەڵدەنێن و دەيشەرعێنن، هەتا دوێنێ بوو خەڵكانێك بە (ئيشتراكى)يەت هەڵخەڵەتاو فريوى خوارد، كەسانێكمان لێ قوت بوويەوە بە بيدعەى

---

[51] متفق عليه: رواه البخاري (٦٢١٢) و مسلم (٢٢٩١).

[52] (سحقا، سحقا): واتە دوورى، دوورى، وە لەسەر چاوگەكە دايناوە، وە دووبارەى كردۆتەوە بۆ دڵنيايى و جەخت كردنەوە.

(ئیشتراكیەتی ئیسلام)، و نەتەوە پەرستی (قەومی یەت)و عەرەبچێتی یان (كوردایەتی) و تێكەڵ یان كرد بە ئیسلام... وە ئەمڕۆ زۆرێك لە وانەی بەسەر دەستوورە دەستكردە زەمینیەكاندا هەڵدەنێن، و شەرم ناكەن لە ناونانی بەندەكانی بە (فەقیهەكان یان شارەزاكانی قانون)، وەك چواندن و شوبهاندن بە (فوقەهای شەریعەت)، و هەمان دەستەواژە شەرعیەكان بەكار دەهێننەوە، وەك (موشەریع) شەریعەت دانەر و، شەریعەت و، حەڵاڵ و حەرام و، جائیز و ڕێگە پێدراو و (مباح)، ڕێگە پێنەدراو (محظور)، وە پاشان لەگەڵ ئەمەشدا پێیان وایە و وادەزانن، ئەوان لەسەر شتێكن، بەڵكو پێیان وایە ئەوان ڕێگا ڕاستەكەیان دۆزیوەتەوە و لەسەر ڕێگا ڕاست و دروستەكەن ... ولاحول ولا قوة إلا بالله العلي العظيم، سوێند بەخوا ئەمەش هیچ نییە تەنها ڕۆشتنی عیلم و عولەماكان و، گەڕاندنەوەی شتەكان بۆ كەسانی غەیری خۆی، وە چۆڵ بوون و بەتاڵ بوونی كەش و هەوا و زەمانەكە بۆ كەسانی سوك و بێ ئابڕووەكان نەبێت، كە چۆن یان پێ خۆشبێت و حەز لێ بێ ئاوا دەكەن ...

جا داخ و حەسرەتە، بۆ ڕۆشتن و نەمانی عیلم و عولەماكان، وە داخ و حەسرەت، بۆ دین و، بانگ خوازە لەخواترس و دڵسۆزەكانی ...

وە سوێند بێت بە خوا، نامۆیە، نامۆییەك كە هاوشێوەی نییە، ناڵێم لە ناو خەڵكە نەزان و عەوا مەكە، بەڵكو لە نێو زۆربەی ئەوانەی خۆیان داوەتە پاڵ ئیسلام و، ئەوانەی كە تێناگەن لە واتاو مانای (لاإلە إلاالله)، وە واجبات و پێویستی و مەرج و مەبەستەكانی نازانن، بەڵكو زۆربەیان بەشەو و بەڕۆژ، هەڵی دەوەشێننەوە، وە زۆربەیان خۆیان لە شیرك و هۆكارەكانی شیركەوە گلاندوە و، پاشان پێیان وایە و وای دادەنێن ئەوان یەكتاپەرستن (موەحیدن)ن، بەڵكو زۆر لەوە زیاترو پێشیان وایە كە ئەوان لە بانگ خوازو داعیەكانی یەكتاپەرستی (تەوحید)ن...

دەبا بەخۆیاندا بچنەوە، وە ئەگەر بۆ جارێكیش بووە با لە كۆڕێكی عیلمدا كۆ ببنەوە هەتا تێبگەن و فێرببن لە راستی و حەقیقەتی مانای (لاإلە إلاالله)، چونكە ئەمە یەكەم شتە كە خوای گەورە لەسەر نەوەكانی ئادەمی فەرز كردووە كە بیزانن و فێری ببن، وە هەتا مەرج و بەتاڵ كەرەوەكانی بزانن و فێرببن، پێش فێربوونی بەتاڵ كەرەوەكانی دەست نوێژو نوێژ، چونكە هەرگیز نوێژو دەست نوێژ وەرناگیردرێت لەو كەسەی بەتاڵی كردبنەوە، خۆ ئەگەر

پشتيان هەڵكردوو لوت بەرزی يان كرد، ئەوە خۆيان نەبێت هيچ كەس زەرەر ناكات، بەڵكو تەنها خۆيان رەنج بەخەسار دەبن ...

وە لێرەدا بە وتەيەكی بەرزو بەنرخی شێخی فەرموودە ناس (احمد) شاكری فەرموودە ناس كۆتايی بە قسەكانم دەهێنم، كە تێيدا ڕەدی هاوشێوەی ئەو كەسانە دەداتەوە كە وتەی خوای گەورە دەگۆڕن و تەحريفی دەكەن و قسە و درۆ بەناوی خوای گەورەوە دەكەن (پاك و بێگەردی بۆ خوای گەورە)، ئەويش بە بەڵگە هێنانەوەيان بە وتەی خوای گەورە كە دەفەرموێت : ﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ﴾. واتە: كارو باری نێوانيان بە پرس و مەشوەرەتە )). بۆ سەرخستن و جێبەجێ كردنی ديموكراسی كوفرو بێ باوەڕيی ...

لە پەراوێز (هامشی) پەرتوكی (عمدة التفسير)..[53]دا و لە تەفسيری ئايەتی: ﴿وَشَاوِرْهُمْ فِي الْأَمْرِ﴾. دا و ئايەتی ﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ﴾.دا دەفەرموێت: (( اتخذها اللاعبون بالدين في هذا العصر _ من العلماء و غيرهم_ عدتهم بالتضليل في التاويل، ليواطؤا صنع الإفرنج في منهج النضام الدستوري الذي يزعمونه، والذي يخدعون الناس بتسمينه (النظام الديمقراطي)!، فاصطنع هؤلاء اللاعبون شعارا من هاتين الايتين، يخدعون به الشعوب الإسلامية أو المنتسبة للإسلام. يقولون كلمة حق يراد بها الباطل، يقولون: (ألإسلام يأمر بالشورى) ونحو ذلك من الألفاظ )).

واتە: لەم سەردەمەدا گەمە كەرەكان بە ئايينی ئيسلام، لە زاناكان و غەيری ئەوانيش، كردويانە بە توشێوی گومڕاكردن بە تەئويل كردن، بۆ ئەوەی هەتا كارو كرداری ئيفرەنجی يەكان لەو نيزامە دەستوری يەی كە بانگەشەی بۆ دەكەن كۆبكەنەوە، كە بەهۆيەوە خەڵكی پێ هەڵدەخەڵەتێنن و لە خشتەيان دەبەن، ئەويش بەناو لێنانی بە (نيزامی ديموكراسی)!، جا ئەو گاڵتە چييانە لەو دوو ئايەتەی قورئان دروشمێك يان دروست كردووە، كە ئوممەتی ئيسلامی يان ئەو گەل و نەتەوانەی بۆ ئيسلام دەگەڕێنەوە پێ چەواشە دەكەن، (( قسەيەكی

[53] ) عمدة النفسير، (ج٣/ هامش ص ٦٤-٦٥).

راست و حەق دەكەن و مەبەستیش یان پێی ناهەقی و باتڵە ))... [٥٤]/ ئەویش دەڵێن: ئایینی ئیسلام فەرمان دەكات بە شورا، یان پرس و ڕاوێژ، ئەمانە و هاوشێوەی ئەم قسانە...

بەڵێ بەراستی وایە، ئیسلام فەرمان دەكات بە شوراو ڕاوێژ بەڵام چ شورایەك و كام شورایە ئیسلام فەرمانی پێدەكات؟ خوای گەورە (سبحانه وتعالى) فەرمان دەكات بە پێغەمبەرەكەی (صلى الله عليه وسلم) و پێی دەفەرموێت: ﴿وَشَاوِرْهُمْ فِي الْأَمْرِ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ﴾. واتە: ئەی (محمد) لە كارەكانتدا پرس و راوێژو مەشوەرەت بە هاوەڵەكانت بكە، پاش پرس و ڕاوێژ، كاتێك لێ بڕایت بۆ ئەنجام دانی كارەكەت، پشت بەخوا ببەستە و بڕۆ كارەكەت جێبەجێ بكە )). [٥٥]

واتاو مانای ئایەتەكە ڕوون و ئاشكراو وازحە، هیچ پێویست بە تەفسیر ناكات و، تەئویل قبوڵ ناكات، ئایەتەكە فەرمانێكە بۆ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پاشان بۆ ئەوەی دوای ئەو دەبێتە وەلی و لئەمر: كە راو بۆچوونی ئەوانە بخاتە ڕوو، كە بە ئەهل و كەسانی خاوەن ڕاو بۆچونیان دادەنێت، ئەوانەن كە پێیان دەوترێت (أولو الأحلام والنهى) واتە كەسانەی ژیرو خاوەن فەهم و زیرەكین، لە شتێكدا یان لە باسێكدا كە جێگەی گۆڕینەوەی ڕاو بۆچونەكانە و جێگەی ئیجتهادە لە جێبەجێ كرنیدا، پاشان وتە و بۆچونی ئەوەیان كە لە نێوانیاندا بە حەق و صەواب و بەرژەوەندی دەزانێت هەڵ دەبژێرێت، پاشان سوردەبێت و پێداگر دەبێت لەسەر ئەنجام دانی و جێبەجێ كردنی، بەبێ ئەوەی پەیوەست بێت بە هیچ راو بۆچونێكی هەندێكەوە یان كۆمەڵێكەوە یان كەسێكی دیاری كراوەوە، یان بە راو بۆچونی

---

[٥٤] ) ئەمەش وتەی ئیمامی عەلی یە، كاتێك بە خەواریجەكانی ووت.

[٥٥] ) هەندێك لە زانایانی تەفسیر دەفەرموون: ئایەتەكە لە جەنگی بەدردا دابەزی، كاتێك پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) راوێژی بە هاوەڵەكان كرد كە ئایا لەناو شاری مەدینەدا شەر لەگەڵ موشریكان بكەن، یان لە دەرەوەی شاری مەدینەدا، ئەوەبوو هاوەڵەكان دەرەوەی شاری مەدینەیان هەڵبژارد، بەڵام پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ناو شاری مەدینەی هەڵبژارد، بەڵام پاش گوێ گرتنی پێغەمبەری خوا لە رای هاوەڵە بەڕێزەكان، و بیركردنەوە لە پێشنیارەكەیان، هاتە سەر راكەی ئەوان و راكەی ئەوانی پەسەند كرد و چوو بۆ ماڵەوە و پۆشاكی ئامادە كرد، هەرچەندە دوایی هاوەڵەكان لە راكەیان پەشیمان بوونەوە و هاتنە سەر راكەی سەرەتای پێغەمبەری خوا، بەلام پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) راكەی یەكەمی ئەوانی لای پەسەند بوو، بۆیە پەشیمان نەبوویەوە و فەرمانی كرد بچنە دەرەوەی شاری مەدینە بۆ شەرو كوشتار لەگەڵ موشریكان ... والله أعلم

زۆرینه، نه بەراو بۆچونی کەمینه، ئەگەر لەسەر شتێك یان بڕیارێك یەکلایی بویەوە ئەوە تەوەکول دەکات بە خوای گەورە، وە ئەو بڕیارە جێبەجێ دەکات لەسەر ئەوەی دەیبینێت ...

وە شتێکی بەڵگە نەویست و حاشا هەڵنەگرە، وە لەو شتانەیە کە هیچ پێویستی بە بەڵگە نییە، کە ئەوانەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمانی کردووە بە موشاوەرە و پرس و راوێژ کردن لەگەڵیاندا، وە ئەوانەی دوای ئەو فەرمان دەگرنە دەست ولەدوای ئەو شوێن کەوتەی دەکەن لەمەدا، بریتین لەو پیاوە چاك و صالحانەی کە لەسەر فەرمان و سنورەکانی خوای گەورە وەستاون، ئەوانەی کە تەقوای خوای گەورەیان هەیە، و نوێژەکان بە چاکی دەکەن و، زەکاتیان دەدەن، و تێکۆشەر و مەجاهیدن لە پێناوی خوای گەورەدا، ئەوانەی کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە بارەیانەوە دەفەرموێت: (( ليلني منكم أُولُوا الأحلام والنُهى ))[56] واتە : بائەوانە لە دوامەوە بن کە ژیرن و خاوەن هۆش و زیرەکین و بەباشی لەدین تێگەیشتوون ))....

ئەوان لە بێ باوەڕ و مولحیدەکان نین، وە لە دژو دوژمنانی دینی خوای گەورە نین، وە فاجیرو سنور بەزێن و فەرمان کەر بە فەساد و خراپە کاری و مونکەرات نین، وە لەوانە نین کە پێیان وایە بۆیان هەیە و دەتوانن شەریعەت و قانونێك دابنێن کە پێچەوانەی دینی خوای گەورە بێت، وە شەریعەتی ئیسلام تێکبداو بی ڕوخێنێ، وە ئەوانە و ئەوانە، لە نێوان کافرو فاسقدا، شوێن و حوکمی دروستیان لە ژێر شمشێر (سەیف) یان قامچی (السوط) دایە، نەوەك ڕاوێژو گۆڕینەوەی راو بۆچونەکانیان ....

وە ئایەتەکەی دیکەی سورەتی (الشورى) وەك وێنەی ئەم ئایەتە وایە لە ڕوونی و ئاشکرایی دا، ﴿وَالَّذِينَ اسْتَجَابُوا لِرَبِّهِمْ وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنْفِقُونَ * وَالَّذِينَ إِذَا أَصَابَهُمُ الْبَغْيُ هُمْ يَنْتَصِرُونَ﴾. واتە: ئەو کەسانەی کە بەدەنگی بانگی پەروەردگاری خۆیانەوە چوون، ئەویش بە یەکتاپەرستی و گوێڕایەڵی خوای گەورە، وە بە ڕێك و پێکی نوێژیان کرد، وە کارو باریان لە نێوان خۆیاندا بە مەشوەرەت و پرس و ڕاوێژ بوو، وە لەو ڕزق و ڕۆزییەی پێمان داون دەبەخشن لە ڕێگەی خوادا، وە ئەو کەسانەش کە ئەگەر ستەم و

---

[56] ) صحيح : رواه مسلم (٤٣٢) الصلاة .

ناهەقیان بەرامبەر بکرێت، تۆڵەی خۆیان دەکەنەوە، وە تەسلیم و ملکەچی ستەم کاران نابن، وە مل نادەن بۆیان )).

⋆ ⋆ ⋆

## گومانی چوارەم:
## ( مُشارَكَةُ النَبي صلى الله عليه وسلم في حِلف الفضُول )
## بەژداریکردنی پێغەمبەری خوا( صلى الله عليه وسلم ) لە پەیمانی ( الفضول )دا

دووبارە کۆمەڵێکی دیکە لەو بەناو شارەزاو بانگ خوازە بەهەلاك چوانە، پەیمانی فزوڵیان تێکەڵ بەکارە گەن و فاسیدەکانی خۆیان کردوە، وە بەژداری کردنی پێغەمبەری خوایان (صلى الله عليه وسلم) پێش ناردنی قورئان و بانگەوازی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری خوا، دەچوێنن بە بەژداری کردن لە (پەرلەمان)ە شەرع دانەرە شیرکی یەکاندا ...

لایان وایە ئەگەر کتێبەکانیان بەم گومانانە پڕ کردەوە و چاپێکی جوان و گران بەهای بۆ بکەن و بیرازێننەوە دەتوانن ئەو هەقەی کە خوای گەورە بۆ زیاتر لە چواردە سەدەیە پاراستویەتی بیشێوێنن و بیشارنەوە، دیارە ئەوان بێ ئاگان لەوەی خوای گەورە هەرگیز کاری خائین و فاسیدەکان سەرناخات، وە هەرکاتێك بێت پشتیان ئەشکێنێ و ڕسوایان دەکات، و لە سورەتی (یوسف) دا دەفەرموێت: ﴿وَأَنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي كَيْدَ الْخَائِنِينَ﴾. ٥٢) هەر دەبێت هەموو کات هەق و ڕاستی یەکان سەربکەون بەسەر ناهەقی و درۆو باتڵەکاندا ... ئەمەش بێ گومان سوننەتێکی خوایی (ڕەبانی) یە، کە خوای گەورە دایناوە ...

### ئێمەش بە تەوفیقی خوای گەورە پێیان دەڵێین:

ئەو کەسەی ئەم شوبهە دەکاتە بەڵگە، یان ئەوەتا نازانێت پەیمانی فزوڵ (الفضول) چییە، وە وورێنە دەکات بەوەی نایزانێ، وە قسە دەکات لەوەی تێنەگەیشتووە و فێر نەبووە .

یان ئەوەتا راستی و حەقیقەتی پەیمانەکە دەزانێت، بەڵام دەیەوێت هەق تێکەڵی ناهەق و باتڵ بکات بەسەر خەڵکیدا، هەتا رووناکی بپۆشێت بە تاریکی و شیرك بە ئیسلام .

چونکە پەیمانی (فضول) وەك (ئیبن ئیسحاق) لە سیرەکەیدا و (ئیبن کەثیر) لە (البداية والنهاية).[57] داو (ئیمامی قورطبي) لە تەفسیرەکەیدا.[58] وجگە ئەوانیش لە زانایان، دەگێڕنەوە کاتێك ڕوویدا کە: (( اجتمعت قبائل من قريش، في دار عبدالله بن جدعان _لشرفه و نسبه_ فتعاقدوا و تعاهدوا على ألا يجدوا بمكة مظلوما من أهلها إلا قاموا معه حتى ترد عليه مظلمته، فسمت قريش ذلك الحلف حلف الفضول، أي حلف الفضائل )). انتهى كلامه رحمه الله/... واتە: پەیمانی (فضول) ئەوکاتە ئەنجام درا کە کۆمەڵێك لە هۆزەکانی قورەیش کۆبونەوە لە ماڵی (عبدالله کوری جودعان) ئەویش لەبەر شەرەف و نەسەبی، وە یەکیان گرت و ڕێك کەوتن لەسەر ئەوەی کە نابێت لە شاری (مەککە)دا هیچ ستەم لێکراوێك هەبێت، لە کەس و کاری خۆیان و جگە لە کەسوکاری خۆیان، ئیلا ئەوان دەچنە پاڵی و بەرگری لێ دەکەن هەتا ئەو کاتەی ماف و حەقەکەی بۆ دەگێڕنەوە، وە قورەیش ئەم پەیمانەیان ناونا بە پەیمانی (فضول) واتە پەیمانی چاکە کان )).

وە ئیمامی سیرە زان و موفەسیر، ئیبن کەثیری دیمەشقی (رحمە الله) لە پەرتوکی (البداية والنهاية) دا دەفەرموێت:

پەیمانی (فضول) بە شەرەف ترین و بەرز ترین پەیمان بووە لەناو عەرەبەکاندا کە تائێستا بیستراوە، وە یەکەم کەس کە بانگەشەی بۆ کردو قسەی لێ کرد، (زوبەیری کوری عبدالمطلب) بوو، وە هۆکارەکەشی ئەوەبوو کە پیاوێك لە (زوبەیدی) یەکان بە کۆمەڵێك کەل و پەلو شتومەکەوە هاتە ناو مەککە، وە (العاصی کوری وائل) شتەکانی لێ کڕی و پارەو حەقەکەی پێنەدا، وە کابرای (زوبەیدی) پەنای بردە بەر کۆمەڵێك لە هۆزە هاوپەیمانەکان،

---

[57] ) البداية والنهاية لابن كثير رحمه الله (ج٢/ ص ٢٩١).

[58] ) الجامع لأحكام القران (٦/٣٣) و (١/١٦٩) .

بەلاّم پشتیان تیٚ کرد و ئامادە نەبوون یارمەتی بدەن لە سەندنەوەی حەقەکەی لە (العاصی کوری وائل)، و کابرای زوبەید یان تورە کرد، ئیتر کابرای زوبەیدی کاتیٚك ئەم خراپە و شەرەی بینی، بەرە بەیان لەگەلّ هەلّهاتنی خۆر چوویە سەر کیٚوی (ئەبی قوبەیس) ، کە لەو کاتەدا قورەیشی یەکان لە دەوری کەعبەدا بوون، و بەهەموودەنگی یەوە هاواری کردو ووتی:

يا آل فهر لمظلوم بضاعته ببطن مكة نائي الدار والنفر

ومحرم أشعث لم يقض عنرته يا للرجال وبين الحجر والحَجَرِ

إن الحرم لمن ماتت كرامته ولا حرام لثوب الفاجر الغدر

کە (زوبەیری کوری عبدالمطلب) ئەمەی بیست، خیٚرا هەستاو وتی: ئەو هەق خوراوە بۆچی پشت گویٚ خراوە؟ ئیتر پاش ئەمە (هاشم) و (زوهرە) و (تیم بن مرە) لە مالّی (عبدالله ی کوری جودعان) کۆبوونەوە، وە ئەویش خواردنیٚکی چاکی بۆ ئامادە کردن و، وە لە (ذي القعدة) ی مانگی (حەرام)دا پەیمان یان بەست و بەلّیٚن یان دا بەخوا، کە یەك دەست بن پیٚکەوە و لەگەلّ یەکدا لەگەلّ هەموو ستەم لیٚکراویٚك دابن لە دژی هەر ستەم کاریٚك، هەتا هەق و مافەکەی بۆ دەگیٚرنەوە، تاوەکو دەریا پارچە خوریەك تەڕ دەکات و، شاخی (ثەبیر) و (حەراش) چەسپاوبن لە شویٚنی خۆیاندا، وە لەسەر یارمەتی و بژیٚوی ژیانیان کۆلّ نەدەن، لەبەر ئەمە قورەیش ئەم پەیمانەیان ناونا بە پەیمانی (فضول) چاکەکان، وە وتیان بەراستی ئەوانە چوونەتە ناو کاری چاکە و پیاوەتی یەوە، پاشان چوون بۆلای (العاصی کوری وائل) و شت ومەکەکانی کابرای (زوبەیدی)یان لیٚ سەندەوە، و بۆیان گەراندەوە ...

وە (قاسمی کوری ثابت) یش لە فەرموودەیەکی (غریب) نامۆدا باسی کردووە کە هۆکاری پەیمانەکە بەم جۆرە بووە:

کە پیاویٚکی (خەثعەم)ی هات بۆ مەککە، بە مەبەستی حەج یان عومرە، وە کچیٚکی لەگەلّ خۆی هیٚنابوو کە پیٚیان دەووت: (القتول) و جوانترین و گەش ترین کچ بوو، ئەوەبوو (نەبیهی کوری حەجاج) لیٚی سەندو بردی شاردیەوە، وە خەثعەمی ووتی: کیٚ پشت گیریم دەکات لە دژی ئەو کابرایە، واتە (نەبیهی کوری حەجاج)؟ پیٚیان ووت: برۆ پەنا بەرە بەر هاوپەیمانانی (فضول)، ئیتر چوو بۆلای کەعبە و بە دەنگی بەرز هاواری کرد: (( یا لحلف

الفضول )) ئەی هاوپەیمانانی (فضول) : ئیتر ئەوانیش لە هەموو لایەکەوە بەرەو پیری هاتن و، شمشێرەکانیان دەرهێنابو و دەیان ووت: ئەوە کۆمەکیت بۆ هات چیتە یان چیت دەوێت..؟[59]

ئەویش ووتی: (نەبیهی کوری حەجاج) ستەمی لێ کردوم بەوەی بە زۆر و ستەم کچەکەمی لێ سەندوم و بردویەتی، ئیتر ئەوانیش چوونە پاڵی و لەگەڵی ڕۆشتن هەتا چوونە بەردەم دەرگای ماڵەکەی، ئەویش هاتە دەرەوە، و پێیان ووت: هاوار بەماڵت، خێرا ئەو کچە بگەڕێنەوە، چونکە ئەزانیت ئێمە کێین و لەسەر چی کۆبوینەتەوە و پەیمان مان بەستووە، (نەبیهـ) ووتی: باشە پێتان دەدەمەوە، بەس با تەنها ئەم شەو لام بمێنێتەوە هەندێك لەزەتی لێ ببینم، وتیان : نەخێر (( ولا شخب لقحة )). واتە: نەخێر نایەڵین لات بمێنێتەوە ئەوە ندەی ئەندازەی دۆشینی حوشترێکیش )). ئیتر ئەویش ترسا و کچەکەی پێدانەوە ...

وە زوبەیر لەبارەی پەیمانی (فضول) دا وەڵێ:

| | |
|---|---|
| إن الفضول تعاقدوا و تحالفوا | الا يقيم ببطن مكـــــة ظالم |
| امر عليه تعاقدوا و تواثقوا | فالجار والمعتر فيهم سالم.[60] |

---

[59] ) ئاگاداربە:

ئەگەر ئێمە ئەمەمان کردە بەڵگە لەسەر دروستی پێك هێنانی یان دروست کردنی ڕێکخراوێك یان دەستەیەکی چەکدار بۆ سەر خستن و نوصرەتی ستەم لێکراوەکان و نکوڵی کردن و دژایەتی خراپە کارەکان، ئەگەر دەوڵەتی ئیسلامی نەما بێت و ئیمامیش نەبێت، بەو بەڵگەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) وەسف و سەنای داوە بەسەر ئەو پەیمانەدا، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو لەکاتی دەوڵەتی کوفرادا ئەو پەیمانە بەستراو، پێشەوایەك نەبوو .... دەڵێم: ئەگەر ئێمە ئەو بەڵگەیان بکەینە بەڵگە لەسەر ئەوەی وتم ئەوە بە بیدعە چیمان لەقەڵەم دەدەن، و چەندە هێرشیان دەکردینە سەرو قسەی ناشرین یان پێ دەوتین ... بەڵام بەڵگە هێنانەوە پێی لەسەر دروستی سوێند خواردن لەسەر ڕێز گرتنی شیرك و بەژداری کردن لە تەشریعدا، بە گوێرەی مادەکانی دەستووری ئیبلیس، و جگە ئەمانەش لە گومڕایی و شیرکیات و لادانیان، ئەمەیان شتێکە عەقڵە پوتەکەیان وەریدەگرێت، جا دووری بۆیان دووری بۆیان ....

[60] ) البداية والنهاية للحافظ ابن كثير .

جا لەو پەیمانەداو، لە دەوری ئەو مەبەستانەدا ئەو فەرموودە دادە باس دەکرێت کە ئیمامی (بەیهەقی) و (الحمیدی) ڕیوایەتیان کردووە وەگێڕنەوە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (( لقد شهدت في دار عبدالله بن جدعان حلفا ما أحب أن لي به حمر النعم ولو أدعى به في الإسلام لأجبت )).[٦١] واتە: من لە ماڵی عبداللە کوری جودعان بەژداری پەیمانێك بووم، کە بەلامەوە خۆشترە، لە حوشترە سورە کان، کە چاکترین حوشترە لەلای عەرەبەکان، خۆ ئەگەر لە ئیسلامیشدا بانگ بکرێم بۆی ئەوەی دەچم بەدەمیەوە و بەژداری تێدا دەکەم )).

وە هەروەها ئیمامی (الحمیدی) لە ڕیوایەتەکەدا ئەمەشی بۆ زیاد کردووە کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (( تحالفوا أن يردوا الفضول على أهلها وألا يعد ظالم مظلوما )). واتە: هاوپەیمانی بکەن بۆ ئەوەی چاکەکان و حەقەکان بگەڕێننەوە بۆ خاوەنەکانیان، وە هەتا هیچ ستەم کارێك نەگەڕێتەوە و هەرەشە نەکاتە سەر ستەم لێکراوێك ))...

## ئێمەش لێرەدا پرسیار لەوانە دەکەین و دەڵێین:

⋆.. ئەی بەناو شارەزاکان و ئەهلی فیقه، باشە ئەم پەیمانە وچاکە و پیاوەتی ئەنجام دەرانی ئەم پەیمانە چ بەڵگەیەکی تێدایە و چ پەیوەندییەکی هەیە بە چوونە ناو ئەنجومەنێك، کە تێیدا شەریعەت لەگەڵ خوای گەورە دادەنێت، لەسەر بنەمای دەستووری ئیبلیس، کە ئەندامانی بە سوێند خواردن لەسەر ڕێز گرتن لە (یاسق)ی کافرو یاساو، پشت گیری و موالات بۆ بەندە و طاغوتەکانی دژ بە خوای گەورە و شوێن کەوتووانی دینەکەی دەکەنەوە، ئەوانەی کە بوونەتە پشت و پەنای دوژمنانی خوای گەورە و کوفرو لە دین دەرچوون یان ؟؟؟

[٦١] ) رواه امام البيهقي في المصنف، والحميدي، وصححه الاباني رحمه الله في صحيح فقه السيرة، وقال حديث صحيح.

⋆.. ئايا پەیمانی (فضولَ) شیرك و كوفر و شەریعەت دانان لەگەڵ خوای گەورە و، ڕێز گرتن لە دینێك جگە لە دینی خوای گەورەی تێدا بوو، هەتا بیكەنە بەڵگە و بكرێتە بەڵگەیەكی ڕاست و صەحیح ؟؟؟

ئەگەر وتتان بەڵێ ...: ئەوە دیارە ئێوە پێتان وایە كە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بەژداری كردووە لە بە بێ باوەری و شەریعەت دانان، وە شوێن دینێك كەوتووە لە جێگەی دینی خوای گەورە، خۆ ئەگەر ئەو لە ئیسلامیشدا بانگەوازی ئەمەی بۆ بكرایە ئەوە دەیكرد و دەهات بە دەمیەوە !! وە هەركەس بۆچوونی بەم جۆرە بێت و پێی ئاوا بێت، ئەوە هەردوو جیهانەكان، جنۆكە و مرۆڤەكان شایەتن لەسەر بێ ئیمانی و هەڵگەڕانەوەی لە ئیسلام و زەندیقیەكەی....

خۆ ئەگەر وتیش تان ....: نەخێر هەرگیز كوفرو شیرك و شەریعەت دانانی تێدا نەبووە، بەڵكو خراپە و مونكەرێكیش لە مونەكەراتەكانی تێدا نەبووە، وە هەموو ئەوەشی تێیدا بووە بۆ سەر خستن و نوصرەتی ستەم لێكراوەكان و، بەهانا هاتنی ماڵ خوراوەكان و، هاوشێوەی ئەم كارە چاكانە بووە...

ئەی باشە چۆن زاتی ئەوە دەكەن كە ئەم قیاس و چواندنە حەلاڵ دەكەن و ڕێگە دەدەن بە خۆتان لەسەر چواندنی بە ئەنجومەن و مەجلیسەكانی كوفرو فسوق و یاخی بوون لە خوای گەورە ؟؟؟

⋆.. پاشان ئێمە لێرەدا پرسیارێكی زۆر ڕوون و ئاشكرایان لێ دەكەین، وە شایەتی یەكی ڕوونمان دەوێت لەسەر پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، لە وەڵامی ئەو پرسیارە : ﴿ستُكتَبُ شَهادَتُهُم وَ يُسئَلون ﴾ الزخرف ١٩). واتە: بێ گومان شایەتی یەكەیان دەنووسرێت و پرسیاریشیان لێ دەكرێت))...

جا ئەگەر كەسی بەژدار بوو لەو پەیمانی (فضول)ەدا، جا هەر چۆنێك بێت (من مەبەستم خودی پەیمانەكەیە)، ئەگەر پەیمانەكە وابوو: كە كەس نەتوانێت بەژداری تێدا بكات و ئامادەی ببێت ئیلا لە دەستپێك و سەرەتای هاوپەیمانەكەدا دەبێت سوێند بخوات لەسەر ڕێز گرتن و ئیحترام لە (لات) و (عوزا) و (مەنام)ی سێهەم، وە سوێند بخوات لەسەر

سەرخستنى ئايينى بێ باوەرى و كوفرى قورەيش و پشتگيرى و موالاتيان و، پشتگيرى بت و جەهالەتيان ... پاش ئەمانەش ئينجا سوێند بخوات لەسەر سەرخستن و نوصرەت و پشتگيرى ستەم لێكراوەكان و يارمەتى دانى دەست كورت و داماوەكان، و هاوشێوەى ئەم شتانە ...

دەڵێم: ئا لێرەدا ئەگەر بارو دۆخەكە ئاوا بوايە، پێغەمبەرى خوا (صلى الله عليه وسلم) بەژدارى تێدا دەكرد؟؟ يان وەلآمى دەدايەوە ئەگەر لە ئيسلامدا دووبارە بانگ بكرايە بۆ هاوشێوەكەى ؟؟؟

وەلآم مان بدەنەوە ئەى بەرژەوەندى خوازەكان و خاوەنى قسەو قسەلۆكەكان... ئەى خاوەنى ئاهەنگ و ميهرەجاناتەكان ...

ئەگەر وتيان: بەڵێ، وەلآمى دەدايەوە و بەژدارى تێدا دەكرد، وە هەر بەو جۆرەش بوو، ئەوە تەواوى ئوممەت خۆيان لێ بەرى كردووە، وە هەموو دروست كراوەكانى خواى گەورە شايەتى دەدەن لەسەر كوفرو لەدين دەرچوون يان ...

خۆ ئەگەر وتيشيان: نەخێر، حاشا وەليلا، پاكى بێگەردى بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) شتى وا نەبووە ...

ئەوە دەڵێين: دە ئيتر بەسە فڵتە فلّت و چەنا بازى، ئيتر فێرببن و بزانن بەڵگە هێنانەوە چۆن دەبێت و بەچى دەبێت ...

## گومانى پێنجەم:

## ( مَصلَحَةُ الدَعوَة )

## بەرژەوەندى بانگەواز ( الغايَةُ تُبَرِرُ الوَسيلَة )

**((باركوا لاعنيكم.. من ضربك على خدك فأعرض له الآخر أيضاً، ومن أخذ رداءك فلا تمنعه ثوبك أيضاً.. ومن أخذ الذي لك فلا تطالبه))** (لوقا ٦ مختصراً من ٢٧ – ٣١).

[ئەم گومانەیان هەق وابوو بمان کردایەتە ڕیزی یەکەمی شوبهە و گومانەکانەوە، چونکە ئەم گومانە نامۆ نییە و زۆر لە مێژە شتێکی ناسراوە] ...

دەڵێن: چوونە ناو ئەم ئەنجومەنانەوە بەرژەوەندی و مەصلەحەتێکی زۆری تێدایە، بەڵکو هەندێك یان پێیان وایە: کە ئەو ئەنجومەنانە هەر لەبنەرەتدا بەژەوەندییەکی مورسەلە، وە دەڵێن: بانگەوازە بۆ لای خوای گەورە، وە بۆ کەلیمەی حەق، وە وتویانە: بۆ گۆڕینی هەندێك لە خراپەکاری و کەمکردنەوەی گوشارەکان لەسەر بانگ خوازەکان ... وە دەڵێن: چۆن دەبێت ئەو شوێن و ئەنجومەنانە چۆڵ بکەین بۆ نەصاراو شیوعی و ئەوانی دیکە ... وە هەندێکی دیکەش یان دەڵێن: بۆ بەرژەوەندی حوکمی شەریعەتی خوای گەورە و سەپاندنی دینەکەی لە ڕێگای ئەم ئەنجومەنانەوە ... ئەمانەو جگە لە خەیاڵات و وڕێنە و هەواو هەوەسەکانی دیکەیان ...هەمووی هەر لەدەوری بەرژەوەندی بانگەواز دێن و دەڕۆن .[٦٢]

## ئێمەش بە تەوفیقی خوای گەورە پێش هەموو شتێك لێیان دەپرسین و پێیان دەڵێین:

★.. ئایا کێ بەرژەوەندی و مەصلەحەتی دینەکەی و بەندەکانی دیاری دەکات و دەزانێت، خوای گەورە و زانا؟؟ یان قسەو گومان و بۆچونەکانی ئێوە ؟؟

ئەگەر وتیان : ئێمە.

★.. ئەوە پێیان دەڵێین: دە کەواتە دینی خۆتان بۆ خۆتان، دینی خۆمان بۆ خۆمان، ئەوەی کە ئێوە دەیپەرستن ئێمە نایپەرستین، ئەوەش ئێمە دەیپەرستین ئێوە نای پەرستن ...

---

[٦٢] ) شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە ڕەحمەتی خوای لێ بێت لەم بارەوە فەتوایەکی دوورو درێژی هەیە، کە تێیدا ئەم جۆرە قسەو شوبهانە بەتاڵ دەکاتەوە، بەناوی بەرژەوەندی بانگەوازەوە، وە ئێمەش دیراسەمان کردووە و تەعلیق مان لەسەر داوە و پێشەکی مان بۆ داناوە و لە بلاّو مان کردۆتەوە بەناوی (القول النفیس في خدیعة الابلیس) دەتوانیت بگەڕێیتەوە بۆی بەسوودە ...
وە برایانمان لە (نور) بۆ بلاوکردنەوەی ئیسلامی لە دانیمارك هەستان بە چاپ کردنی و تۆمار کردنی لەسەر کاسێتی دەنگی ..

چونكه خواى گەورە (عزوجل) دەفەرمويێت: ﴿مَا فَرَّطْنَا فِي الْكِتَابِ مِنْ شَيْءٍ﴾.الانعام٣٨). واته: ئێمە لە قورئان (يان لوح المحفوظ) دا هيچ شتێك مان فەرامۆش نەكردووە )).

وە خواى گەورە لەسەر ئەو ديموكراسى خوازانە و هاوشێوەيان دەفەرمويێت: ﴿أَيَحْسَبُ الْإِنْسَانُ أَنْ يُتْرَكَ سُدًى﴾.القيامة٣٨) واته: مرۆڤ وادەزانيێت هەروا بەرەڵا دەكريێت و پشت گوێى دەخەين پاش مردنى و لێپرسينەوەى لەگەڵ ناكريێت ؟؟)).

وە دەفەرمويێت: ﴿أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ﴾. المؤمنون ١١٥). واته: ئێوە پێتان وايە ئێمە ئێوەمان هەروا بەبێ هودە دروست كردووە و ناگەڕێنەوە بۆلامان ؟؟)).

ئەمە لە دين و ڕێباز و ميلەتى ئێمەدا ... بەلاَّم لە ڕێبازو دينى ديموكراسى دا، ئەم ئايەتە راسخ و موحكەمانە هيچ حسابو ئيعتبارێكى بۆ ناكريێت و لە هيچ شوێنێكدا جێى نابێتەوە، و هيچ شوێنێك نييە بۆيان، چونكە لاى ئەوان مرۆڤ بۆخۆى موشريع و شەريعەت دانەرە، واتە هەر خۆيەتى خاوەنى دروست كردن و بنيات نانى شەريعەت، ئيتر چ پێويست بە قورئان دەكات ...! ، وە دەڵێن: بەڵێ: مرۆڤ هەروا بە خۆرايى دروست كراوە، وە ئازادى و حوريەتى رەهاى هەيە لەوەى چى هەڵدەبژێريێت، و بريار لەسەر چى دەدات و چى ناويێت لە شەريعەت و تەشريع و دين... وە گرنك نييە ئەو شەريعەتەى كە دەيەويێت و هەڵى دەبژێريێت، لەگەڵ كيتابى خواى گەورەدا دەگونجێت يان دژى بێت، بەڵكو گرنگ ئەوەيە كە پێچەوانە و دژى دەستور و قانون نەبێت .

﴿أُفٍّ لَكُمْ وَلِمَا تَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ أَفَلَا تَعْقِلُونَ﴾ الأنبياء٦٧) واته: ئۆف (ئاخ) لە ئێوە و لەو شتانەش كە لە جێگەى خواى گەورە بەندايەتى بۆ دەكەن و دەيپەرستن، ئەوە ئێوە تاكەى عاقڵ نابن، تاكەى عەقڵ تان ناكەنە كار ؟))[٦٣].

*.. خۆ ئەگەر وتيشيان: بەڵێ هەر خواى گەورە و بە دەسەلاَّتە بەرژەوەندى و سنورەكان ديارى دەكات، چاكترين ديارى كردن، چونكە هەر خواى گەورە بەدى هێنراوەكانى بەدى

[٦٣] ) خواى گەورە لە سەر زارى پێغەمبەر (ئيبراهيم)ەوە دەفەرمويێت، كاتێك پێغەمبەر ئيبراهيم سەلامى خواى لێ بێت شيرك و خراپى پەرستنى طاغوت و بت و پەيكەرەكانى بۆ گەل و قەومەكەى ڕوون كردەوە.

هێناوه، وه هەر ئەویش زانایه به بەرژەوەندی یەکانیان، چونکه خوای گەوره دەفەرمویت: ﴿ألا يَعلَمُ خَلقَ وَهوَ لَطيفُ الخَبير﴾.ألانعام١٠٣). واته: مەگەر خوای گەوره نازانیٚ کیٚی دروست کردووه و چۆنی دروست کردوه، له کاتیٚکدا زۆر ووردبین و به ئاگایه )).

★.. لیٚیان دەپرسین: گەورەترین بەرژەوەندی و مەصلەحەت له بوندا چییه، که خوای گەوره له کتیٚبەکەی دا بریاری لەسەر داوه، وه هەر لەپیٚناویدا پیٚغەمبەرانی بۆ ناردووه، و کتیٚبەکانی دابەزاندۆته خوارەوه، و جیهاد و شەهادەتیشی لەم ریٚگەیدا داناوه، وه هەر له پیٚناویشیدا دەولّەت و خەلافەتی ئیسلامی دادەمەزریٚت ... ئەی بانگ خوازانی خەلافەت ؟؟؟

ئەگەر له بەرژەوەندی یه بچوکەکاندا سەریان لیٚ تیٚك چوو، وه له ئەصل و بنچینەکان لایاندا .

★.. ئەوه پیٚیان دەلّیٚین: ده ئیتر له وریٚنه و قسەی بیٚ تام بگەریٚن و، دانیشن و فیٚری ئەصل و بنەرەتی دینەکەتان ببن، فیٚری واتای (لاإله إلاالله) ببن، که هیچ کات دەعوه و بانگەواز و جیهاد و شەهادەت وەرناگیردریٚت ئیلا ئەوکاته نەبیٚت که (لاإله إلاالله) جیٚبەجیٚ کرابیٚت و هاتبیٚته دی و واتاو ماناکەی زانرابیٚت .

خۆ ئەگەر وتیان: گەورەترین بەرژەوەندی له بوندا بریتیه له: پاککردنەوەی یەکتاپەرستی بۆ خوای گەوره، وه دوور کەوتنەوه له هەموو ئەو شتانەی که دژین و هەلّی دەوەشیٚننەوه، له شیرك و تەندید .

★.. ئەوه پیٚیان دەلّیٚین: ئەی ژیرەکان، ئەی (ئولو ئەلباب)ەکان دەچیٚته عەقلّەوه، یان عەقلّ دەی بریٚت، که ئەم بەرژەوەندی یه گەورەی یەکلا کراوەی گشتی یه بروخیٚنن، و تیٚکەلّ به (طاغوت)ەکان ببن لەسەر دینیٚك جگه له دینی خوای گەوره، واته (دیموکراسی)، وه شەریعەتیٚکی دیکه له جیٚگەی شەریعەتەکەی وەربگرن و ریٚزی بگرن، واته (دەستور)، وه شویٚن کۆمەلّه پەروەردگاریٚکی شەرع دانەر بکەون لەگەلّ خوای تاك و تەنها و به دەسەلاّت و قەهار ؟؟؟

بەمەش گەورەترین بەرژەوەندی بڕوخێنن لە بووندا، ئەویش یەکتاپەرستی (تەوحید) و، دەرچوون و کافر بوون بە (طاغوت) ... لەبەر هەندێك بەرژەوەندی لاوەکی و جوزئی و گوماناویی نەشیاو ؟؟؟

چ پێوەرو چ عەقڵێك و چ شەرع و دینێك بەمە ڕازی یە، جگە دینی دیموکراسی کوفرو بێ باوەری نەبێت ؟؟؟

★.. ئەوە چۆن هەندێکتان جورئەتی ئەوە دەکات، کە پێی وایە و دەڵێت ئەم ئەنجومەنانە (مەجلیس) لە بەرژەوەندی یە مورسەلەکانە ... کە لە بنەرەتدا لای ئەوان (بەرژەوەندی مورسەل) بریتیە : لەوەی کە شەریعەت شاهیدی بۆ نەداوە، نە بە ڕێگە پێدانی نە بە هەڵوەشاندنەوەی)، ئەی ئایا پێتان وایە کە شەریعەتی ئیسلام شیرك و کوفری هەڵنەوەشاندۆتەوە، وە هەموو ئاینێکی پوچەڵ نەکردۆتەوە کە ئایینی ئیسلام هەڵدەوەشێنێتەوە، وە هەموو ڕێباز و میلەتێك کە ڕێبازو میلەتی یەکتاپەرستی هەڵدەوەشێنێتەوە، ئیسلام پوچەڵی نەکردۆتەوە ..؟؟

★.. پاشان ئەوە چ بانگەوازێکە کە پێتان وایە بانگەوازی بۆ دەکەن، وە ئەوە چ حەقێکە کە پێتان وایە ڕێگری پێ دەکەن لەو ئەنجومەنە شیرکی یانەدا، پاش ئەوەی ئەصل و بنچینەی بنچینەکانی بانگەوازی ئیسلامی و جەمسەری گەورەی حەقی ئاشکراتان پۆشی و لەقەبرتان نا ؟؟ وە ئایا ئەم بنچینە ڕاست و ئەصیلە و بەرژەوەندی یە گەورە دەنێژرێت و لەقەبر دەنرێت هەتا لەسەر حسابی ئەو، مشتومڕو قسە لەسەر شتە لاوەکی و جوزئی و بچوکەکانی ئاین بکرێت ؟؟؟

پاشان کە موناقەشەی ئەو شتە جوزئی و لاوەکی یانە دەکەن – وەك ئەوەی هەوڵ دەدات بۆ حەرام کردنی عەرەق- دەچنە پاڵ چی و پشت بەچی دەبەستن لە داواکانتاندا و بەڵگە بەچی دەهێننەوە و چۆن قسە دەکەن ؟

ئایا دەڵێن: خوای گەورە فەرموویەتی، یان پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی ؟؟؟

پاشان ئەگەر پێتان وابوو یان ئەگەر واتان ووت: ئەوە درۆتان کرد، چونکە ئەوە هیچ حساب و ئیعتیبار و نرخ و بایەخێکی بۆ نییە لە دین و ئایینی دیموکراسی و شەریعەتی دەستور، ئیلا ئەوە نەبێت کە (دەستور) شایەتی لەسەر داوە، و نرخی بۆداناوە ... بێ گومان ئێوە دەڵێن: مادەی دووەم دەڵێ ... وە مادەی ٢٤ .. وە مادەی ٢٥ ... و هاوشێوەیان لە یاساکانی کوفر و گومڕایی، ئایا دوای ئەمە کوفرو شیرك و بێ باوەری تر هەیە؟؟ ئایا ئەوانەی ئەم ڕێگەیان گرتۆتە بەر هیچ بنچینە و ڕێبازو یەکتاپەرستی یەکیان بۆ دەمێنێ ؟؟

﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُوا بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنْزِلَ مِنْ قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَنْ يَتَحَاكَمُوا إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوا أَنْ يَكْفُرُوا بِهِ وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَنْ يُضِلَّهُمْ ضَلَالًا بَعِيدًا﴾.النساء٦٠). ئەی محمد (صلى الله عليه وسلم) ئەوانەت نەبینیوە کە دەڵێن باوەڕیان بەوە هەیە کە دابەزیووە بۆت (قورئان) و بەوانەی بۆ پێش تۆش دابەزیووە، کەچی ئەو مونافیقانە بۆ برینەوە و دادوەری کێشەکانیان دەیانەوێت بچن بۆلای (طاغوت) و بەرنامەی غەیری بەرنامەی خوای گەورە، لە کاتێکدا فەرمانیان پێ کراوە کە بەو بەرنامانە کافر ببن و لێی دەربچن و کاری پێ نەکەن، وە شەیتانیش دەیەوێت گومڕایان بکات گومڕایی کردنێکی بێ سنوور، بۆیە ئاوا سەر بۆ بەرنامە دونیایی یەکان شۆڕ دەکەن )).

وەڵامما بدەنەوە ... ئایا دەکرێت شەریعەتێك یان قانونێك لەو پەرستگا شیرکی و بت پەرستی یانەدا دابنرێت، بە ڕێگایەك جگە لەم ڕێگە شیرکی و کوفری یانە ..؟؟

وەڵامما بدەنەوە ئەی بەناو قسە زان و خاوەن دیدو بۆچونەکان ؟؟!!

وە ئەو حوکم و فەرمان ڕەواییەی کە دەتانەوێت بۆ خوا بێت و لەسەری دەگرین، دەتانەوێت بەم ڕێگەو شێوازە بیگێڕنەوە ..؟؟

ئایا نازانن ئەمە ڕێگەیەکی بێ باوەری و داخراوە ... چونکە ئەگەر سەرکەوتوش بوو – ئەگەر وامان دانا- ئەوە هەرگیز حوکم، حوکمی خوای گەورە نابێت، بەڵکو حوکمی دەستورو حوکمی گەل و حوکمی جەماوەر دەبێت .. وە هەرگیز حوکمی خوای گەورە نابێت و نابێتە بەرنامەی خوای گەورە، مەگەر ئەوکاتە نەبێت کە ملکەچ بوون بێت بۆ وتەی خوای گەورە و، دڵکرانەوە بێت بۆ شەریعەت و بەرنامەکەی و، بەندایەتی کردن بێت بۆی ... بەڵام ئەو کاتەی

تەسليم بوون بێت بە دينی ديموكراسی و، شەريعەتی دەستور و دەسەلأت و حوكمی گەل و جەماوەر ... ئەوە ئەو حوكمە حوكمی (طاغوت)ە، هەر چەندە لەهەمان كاتيشدا لەگەڵ هەندێك حوكمی خوای گەورەدا موافق بێت و يەك بگرێتەوە، چونكە خوای گەورە (سبحانه وتعالى) فەرموويەتی: ﴿إِنِ الْحُكْمُ إِلَّا لله﴾ سورەتی يوسف ٣٩).واتە: هەموو حوكم و بريارێك تەنها و تەنها هەر هی خوايە، وە دەبێت تەنها هەر ئەو حاكم و بڕيار بەدەست بێت )).

وەك چۆن ئەسەدو ئيسلام فەرمووی: ئەگەر لەسەدا نەوەدی حوكميش بۆ خوابێت ئەوە هەر كوفرە، چونكە لەسەدا دەكەی بۆ غەيری خوايە.

وە خوای گەورە نەی فەرموو: ((إن الحكم إلا للناس)) واتە دەبێت حوكم تەنها بۆ گەل بێت))، بەڵكو فەرمووی ﴿إلا لله﴾ واتە دەبێت تەواوی حوكم هەر بۆ خوای تاك و تەنها بێت)).

وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَأَنِ احْكُمْ بَيْنَهُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللهُ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ وَاحْذَرْهُمْ أَنْ يَفْتِنُوكَ عَنْ بَعْضِ مَا أَنْزَلَ اللهُ إِلَيْكَ﴾ المائدة٤٩). واتە: ئەی محمد (صلی الله عليه وسلم) هەر دەبێت لەناو هەموو خەڵكی و شوێن كەوتوانت و خاوەن نامە ئاسمانييەكان بەوە حوكم بكەيت كە خوای گەورە بۆی ناردويت، وە نەكەيت شوێن هەواو هەوەس و ئارەزووی خەڵكی بكەويت، وە ئاگاداربە كە لات نەدەن و هەڵت نەگێڕن لە هەندێك لەو شتانەی كە خوای گەورە بۆی ناردويت لە حوكم و بريارەكانی)).[٦٤]

دەبينين خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿بِمَا أَنْزَلَ اللهُ﴾ بەوەی كە خوای گەورە ناردوويەتی)) وە نەی فەرموو: (( بمثل ما أنزل الله )). بە هاوشێوەی ئەوەی خوای گەورە ناردويەتی )).

---

[٦٤] ) هۆكاری دابەزينی ئايەتەكە بۆسەر تاقمێك لە يەهودی يەكان دابەزی، ئەوانيش (ئيبن سوريا، كەعب، شاس كاتێك كۆبونەوە و وتيان با بچين (محمد) لە خشتە بەرين، و پێی بڵێين لە مەسەلەی رەجمدا پشت گيری مان بكە و با ئەو حوكمە تەعتيل بكەين و لايبەرين، ئەوسا ئێمەش لە هەندێك شتدا بە گوێت دەكەين، خۆشت باش دەزانی ئەگەر ئێمە شوێنت بكەوين تەواوی هۆز و تائيفەكانی ديكەش شوێنت دەكەون، بەڵام پێغەمبەری خوا (صلی الله عليه وسلم) بە گوێی نەكردن، و حوكم و دادوەری گەراندەوە بۆ لای خوای گەورە ./ تەفسيری ئبين عەباس و جگە ئەويش ....

يان نەيفەرموو: (( وان احكم بينهم بما نص عليه الدستور والقانون )). واتە: حوكم بكە لە نێوانیاندا بەوەی کە لە دەستورو قانوندا هەیە و دانراوە ))... بەڵکو ئەمە قسەی موشریکەکانە، لە بەندەی دیموکراسی و دەستورە دەستکردەکان ...

پاشان ئێوە لە کوێن؟ پاش هەموو ئەمانە ئێشتا ئێوە لەسەر گومڕایی و لادانەکەتان سوور و پێداگرن؟ ئەوە سەری خۆتان لە خۆڵا ئەشارنەوە ؟؟ ... ئەوە تەجروبە و ئەزمونی ئەوانەی دەورو بەری هاوشێوەی خۆتان نابینن؟ ئەوە لە جەزائیرو ئەوەش لە کوێت .. ئەمەش لە میصر و ئەوانی دیکەش، ئایا تا ئێستاش تێنەگەیشتوون و دڵنیا نەبوون کە ئەمە یاری و گەمەیەکی کوفری و بێ ئیمانی یە، وە سەما گەیەکی شیرکی ڕێگە داخراوە، وە هەتا ئێستاش لەسەر ئەوە ساغ نەبوونەوە کە ئەم ئەنجومەنانە گەمەیەکن بە دەستی (طاغوت)ەوە، کەی بیەوێت دەیکاتەوە و کەی بیەوێت دایدەخات، وە چ کاتێك بیەوێت هەڵی دەوەشێنێتەوە.. ، وە هیچ قانونێکی تێدا دانانرێت، هەتا ئەو کاتەی (طاغوت) رازی دەبێت لەسەری و بڕیاری لەسەر دەدات .. [٦٥]

ئیتر بۆچی ئەوەندە پێ دادەگرن و سوورن لەسەر ئەم کوفرە ئاشکرایە ... وە لەسەر ئەم زەلیلی و بێ دەسەڵاتی یە ئاشکرایە ؟؟

---

[٦٥]) مادەی (١٣٨) لقی پێنجەم لە ڕەشنووسی دەستوری هەمیشەیی عێراقدا هاتووە: (أ- ئەو یاسا و بڕیارانەی ئەنجومەنی نوێنەران دەیان دات، ڕەوانەی ئەنجومەنی سەرۆکایەتی دەکرێن، بەمەبەستی ڕەزامەندی لەسەریان بە کۆی دەنگ .. ب- ئەگەر ئەنجومەنی سەرۆکایەتی ڕەزامەندی لەسەر نیشان نەدا، یاساکان دەگەڕێنەوە بۆ ئەنجومەنی وەزیران، بۆ دووبارە چاو پیا خشاندنەوەیان، ج- ئەگەر ئەنجومەنی سەرۆکایەتی رازی نەبوو لەسەر بڕیارو یاساکان بۆ جاری دووەم لە ماوەی (١٠) ڕۆژدا لەبەرواری گەیشتنیان، جارێکی تر دەگەڕێندرێنەوە بۆ ئەنجومەنی نوێنەران، لەم کاتەدا ئەنجومەنی نوێنەران مافی ئەوەی هەیە بە زۆرینەی (٣/٥) ی ئەندامەکانی بڕیاری لەسەر بدات، کە ئیتر ناتوانرێت نارەزایی لەسەر دەربڕدرێت، و بە پەسەند کراو دادەنرێت ...

وە هەروەها مادەی (٦٥) لە پرۆژە دەستوری هەرێمی کوردستانی عێراق: سەرۆکی هەرێم سەرە رای هەر دەسەڵاتێك، کە بەیاسا پێی بدرێت، ئەم دەسەڵاتانەی خوارەوەش پیادە دەکات ... دووەم: دەرکردنی ئەو بڕیارانەی کە پەرلەمانی کوردستان دایدەنێت، لە ماوەی (١٥) ڕۆژ لە وەرگرتنیانەوە بۆی هەیە لەو ماوەیەدا نارەزایی لەسەر هەموویان یان بەشێکیان دەربڕێ و بیان نێرێتەوە بۆ پەرلەمان بۆ چاو پیاخشاندنەوەیان، وە دواتر بڕیاری پەرلەمان لە بارەیانەوە بنەبڕ دەبێت ))...

پاشان لەگەڵ ئەمەش دەبینین کۆ دەبنەوە و هەراو هوریا دەنێنەوە و دەڵێن: چۆن ئەو ئەنجومەنانە چۆڵ بکەین و بەجێیان بهێڵین بۆ شیوعی و بێ دین و خاچ پەرستەکان ... جگە لەوانیش لە مولحیدەکان ؟؟

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَا يَحْزُنْكَ الَّذِينَ يُسَارِعُونَ فِي الْكُفْرِ إِنَّهُمْ لَنْ يَضُرُّوا اللَّهَ شَيْئًا يُرِيدُ اللَّهُ أَلَّا يَجْعَلَ لَهُمْ حَظًّا فِي الْآخِرَةِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾آل عمران١٧٦). واتە: ئەی محمد (صلى الله عليه وسلم) خەفەت بارو دڵتەنگ مەبە، بەو مونافیق و بێ باوەڕانە کە پێشبڕکێ و پەلە دەکەن بۆ دژایەتی کردنی تۆ، ئەوانە بە هەڵگەڕانەوەیان و لەدین دەرچوونیان هیچ زیانێك ناگەیەنن بە خوای گەورە، وەك چۆن ئەگەر ئیمان و باوەڕیش بێنن هیچ سودێك ناگەیەنن بە خوای گەورە، خوای گەورە ئەیەوێت لە دواڕۆژدا هیچ بەشێکیان نەبێت و بێ بەشیان بکات، وە خوای گەورە سزایەکی زۆر سەختی بۆ ئامادە کردوون )).[٦٦]

ئەگەر ئێوە لە دەستەو کۆمەڵی مولحید و بێ باوەڕەکانن، ئەوە پیرۆزتان بێت، ئەو بەش و بەژداری یەتان .. بەژداریان بکەن بە کوفرو شیرکیان ئەگەر دەتانەوێت، بەڵام چاك بزانن کە بەژداری کردن لەو حاڵ و بارەدا و بەو شێوەیە، تەنها لە سنورو حەدی دونیادا ناوەستێت، بەڵکو وەك خوای گەورە لە سورەتی (النساء) دا پاش ئەوەی حەزەر و ئاگاداری دەدات لە هاوشێوەی ئەو ئەنجومەنانە، وە فەرمان دەکات بە جیابوونەوەی شوێن کەوتوانی و بەژدار بووەکانی، و دانەنیشتن لەگەڵیاندا، ئەگەر نا ئەو کەسەی کەلەگەڵ یان دانیشتووە وەك ئەوان دەبێت و حسابی ئەوانی بۆ دەکرێت، بە ئاگادارییەوە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ اللَّهَ جَامِعُ الْمُنَافِقِينَ وَالْكَافِرِينَ فِي جَهَنَّمَ جَمِيعًا﴾.١١٩) واتە: خوای گەورە کافرو دوو ڕووەکان لە ئاگری دۆزەخدا پێکەوە کۆدەکاتەوە )).

ئایا پاش هەموو ئەمانە، دڵنیا نەبوون و یەقین تان بۆ دروست نەبوو کە شیرکی ئاشکرایە، وە کوفرو بێ باوەری ڕوون و بێ خەوشە، وە ئایا نەتان زانی کە ئەوە ئایینێکە جگە

[٦٦] ) ئیمامی قورطبي لە تەفسیرەکەیدا دەفەرموێت: ئەوانە کۆمەڵێك بوون لە ترسی موشریکەکان مورتەد بوونەوە، بۆیە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بە موورتەد بوونەوەیان زۆر غەمبار بوو ..

له ئايينى خواى گەورە ؟؟وە ڕێبازو میلەتێکە جگە لە ڕێبازو میلەتی یەکتاپەرستی و تەوحید ؟؟ ئیتر بۆچی هەر هەلاٌ هەلاٌتانە لەسەری ... وازیان لێ بێنن بۆخۆیان .[٦٧]

بەڵێ وازیان لێ بێن و لێی دوور بکەونەوە بۆ شوێن کەوتوانی ئەهل و میلەتی خۆی، وە شوێن میلەت و ڕێبازی ئیبراهیم بکەون (علیه السلام)، کە ئەو لە موشریکان نەبووە و حەنیف بووە، وە وەك نەوەکەی یوسف بڵێن (علیه السلام)، کاتێك ئەو لاوازو بێ دەسەلاٌت بوو لەو دیو دیوارەکانی بەندیخانەداو دەیفەرموو: ﴿ إِنِّي تَرَكْتُ مِلَّةَ قَوْمٍ لَا يُؤْمِنُونَ بِاللهِّ وَهُمْ بِالْآخِرَةِ هُمْ كَافِرُون * وَاتَّبَعْتُ مِلَّةَ آبَائِي إِبْرَاهِيمَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ مَا كَانَ لَنَا أَنْ نُشْرِكَ بِاللهِّ مِنْ شَيْءٍ﴾ سورەتی یوسف ٣٧ — ٣٨).

واتە: چاك بزانن کە من ڕێبازی (میلەتی) ئەو کەسانەم واز لێهێناوە، کە باوەڕیان بە خوا و ڕۆژی دوایی نییە، وە بۆخۆم کەوتومەتە شوێن ڕێبازی باب و باپیرانم: ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقوب، هەرکەسێکی دیکەش ئاوا بکات، هەر ئاوا سەرکەوتو دەبێت، وە بۆ ئێمەش نییە (خانەوادەی پێغەمبەران و شوێن کەوتوانیان) هیچ شتێك بکەینە هاوبەش و هاوەڵی خوای گەورە )).

کەواتە: دوور بکەونەوە لە (طاغوت) و ئەنجومەنەکانی، وە بەرائەت و تەبەرای لێ بکەن و پێی کافرو بێ باوەڕ ببن مادەم ئاوایە.

ئەوەیە حەقی ڕوون و ئاشکرا ... وە نور و ڕووناکی دیار و بڵێسەدار، بەلاٌم زۆربەی خەڵکی نازانن.

﴿ وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللهَّ وَاجْتَنِبُوا الطاغوت فَمِنْهُمْ مَنْ هَدَى اللهُّ وَمِنْهُمْ مَنْ حَقَّتْ عَلَيْهِ الضَّلَالَةُ﴾ النحل ٣٦) واتە ئێمە بۆ هەموو گەل و نەتەوەیەك (قەومێك)

---

[٦٧] ) ئەمەش شوبهەی مونافیقەکانی قورەیشە ئێستا بۆ ئەمانە ماوەتەوە، کاتێك خوای گەورە هیجرەتی لە مەککەوە بۆ مەدینە لەسەر پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و باوەڕ دارەکان واجب کرد، هەندێك لە مونافیق و دوو ڕووەکان دەیان ووت: ئێمە چۆن ئەم خاکە چۆڵ کەین بۆ کافرەکان، یان بۆ قورەیشی یەکان، هەتا چۆن بیانەوێت ئاوا بکەن تێیدا، کە لە ئەصلدا لەبەر ئەمە وایان نەدەوت، بەڵکو لەبەر خاتری خۆیان و بۆ ئەوەی هیجرەت نەکەن ....

پێغەمبەرێکمان ڕەوانە کردووە، هەتا بەندایەتی خوای گەورە بکەن و واز لە بەندایەتی و گوێڕایەڵی (طاغوت) بهێنن، جا خوای گەورە ڕێنمویی و هیدایەتی هەندێکی لەو گەلانە کرد بە ئیمان هێنانیان و بێ باوەر بوون یان بە طاغوت، وە هەندێکیشان بەهۆی زۆری تاوان و نکوڵی کردنیان گومڕایی یەخەی گرتن )).

﴿يَا صَاحِبَيِ السِّجْنِ أَأَرْبَابٌ مُتَفَرِّقُونَ خَيْرٌ أَمِ اللَّهُ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ * مَا تَعْبُدُونَ مِنْ دُونِهِ إِلَّا أَسْمَاءً سَمَّيْتُمُوهَا أَنْتُمْ وَآبَاؤُكُمْ مَا أَنْزَلَ اللَّهُ بِهَا مِنْ سُلْطَانٍ إِنِ الْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ أَمَرَ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا إِيَّاهُ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾ سورةتی یوسف ٣٩-٤٠).

واتە: ئەی هەردوو هاوڕێی بەندیخانەکەم: ئاخۆ چەند خوایەکی جیا جیا (موتەفەریق) بپەرسترێن چاکترە، یان هەر یەك خوای تاك و تەنها و زاڵ و بە دەسەلاّت بەسەر هەموو شتێکدا ؟؟ ئەوەش چاك بزانن ئەوانەی ئێوە لە جێگەی خوا دەیان پەرستن تەنها چەند ناوێکی بێ ناوەڕۆکن، ئێوە و باو و باپیرانتان بە ئارەزووی خۆتان ناوتان ناون و کردوتانن بە خوا/ وە خوای گەورە هیچ بەڵگەیەکی بۆ ڕاستی پەرستنی ئەوانە نەناردووە، وە هەموو حوکم و بریارێك تەنها و تەنها هەر هی خوایە، وە دەبێت تەنها هەر ئەو حاکم و بڕیار بەدەست بێت، وە فەرمانی داوە کە: ئێوە دەبێت تەنها بەندایەتی بۆ ئەو بکەن و ئەو بپەرستن و گوێڕایەڵی ئەو بکەن، نەك لە حیزب و عەشیرەت و گروپ و خێڵ ....، هەر ئەو ئاینە (یەکتاپەرستی) ڕاست و ڕەواو پایە دارە، کە پێم ڕاگەیاندی و بانگەوازم بۆ کردی، بەلاّم زۆربەی خەڵکی نازانن کە ئایینی یەکتاپەرستی (تەوحید) ڕاست و ڕەوا یە )).

خەڵکینە: لێی دوور بکەونەوە و بەرائەت بکەن لە شوێن کەوتوانی و شیرکەکەی، پێش ئەوەی کار لە کار بترازێت ... وە پێش ئەوەی ئەو ڕۆژە بێت کە ئەوە بەرز ترین و گەورەترین شت دەبێت کە خۆزگەی بۆ دەخوازن، پاش لەدەست چوونی کاتەکەی و کارلەکار ترازان، کە ئەو ڕۆژە پەشیمانی و حەسرەت و هەناسە هەڵکێشان هیچ سوودی نابێت بۆتان ...

﴿ إِذْ تَبَرَّأَ الَّذِينَ اتُّبِعُوا مِنَ الَّذِينَ اتَّبَعُوا وَرَأَوُا الْعَذَابَ وَتَقَطَّعَتْ بِهِمُ الْأَسْبَابُ۞ وَقَالَ الَّذِينَ اتَّبَعُوا لَوْ أَنَّ لَنَا كَرَّةً فَنَتَبَرَّأَ مِنْهُمْ كَمَا تَبَرَّءُوا مِنَّا كَذَلِكَ يُرِيهِمُ اللَّهُ أَعْمَالَهُمْ حَسَرَاتٍ عَلَيْهِمْ وَمَا هُمْ بِخَارِجِينَ مِنَ النَّارِ﴾ البقرة ١٦٦_١٦٧).

واته: له ڕۆژی دواییدا، کاتێك سەرکردەوە و پێشەوا (طاغوت) و موشریکەکان سزای دۆزەخ دەبینین، خێرا حاشا دەکەن لە شوێن کەوتەکانیان و بەرائەتیان لێ دەکەن، وە هەموو ئەو پەیمان و بەڵێنانەیان بیر دەچێتەوە کە لە دونیادا دابوویان بەیەك، یان کە هیوای گەڕانەوەیان نەما بۆ دونیا و تەوبە کردن، وە ئەوانەشی شوێن ئەو سەرکردە و پێشەوا موشریکانە کەتبوون هاوار دەکەن و دەڵێن: خۆزگە ئەگەر هەر بۆ تەنها جارێکیش بووە دەگەڕاینەوە دونیا، ئەوە ئێمەش یەخەمان لێ هەڵدەتەکاندن و، بەرائەت و حاشامان لێ دەکردن، وەك چۆن ئەمڕۆ ئەوان (سەرکردە و پێشەواو گەورەکانمان) خۆیان لە ئێمە بەری کردوو حاشایان لێ کردین، ئیتر خوای گەورە بەو جۆرە کار و کردەوەکانی خۆیانیان پیشان دەدات، بەهەر دوولایان، سەرکردەکان و ئەوانەش کە شوێن یان کەوتبون و گوێڕایەڵی یان بوون لە دونیادا، وە دەبێتە کۆڵ و کەسەر بۆ هەردوو لایان و، بۆ هەتا هەتاش هەر لە ئاگری دۆزەخدا پێکەوە دەمێننەوە )).

وە هەر ئێستا لێی دوور بکەونەوە، وە هەر ئێستا دانی پێدا بنێن و بە خاوەنەکانی بڵێن -ئەگەر ئێوە لەسەر ڕێبازی ئیبراهیم و ڕێگەی پێغەمبەران – وەك چۆن ئێمە لە کۆتایی قسەکانماندا پێیان دەڵێین:

**ئەی بەندەی قانونە دانراوە کان ... و دەستوورە دەستکردەکان**

**ئەی هاوەڵانی دینی دیموکراسی ... ئەی ئەرباب و پەروەردگارە شەرعدانەرەکان**

**ئێمە**

بۆ نزيك بوونەوەمان لە خواى تاك و تەنهامان لە ئێوە بەرين و تەبەرا لە خۆتان و رێبازەكەتان دەكەين

وە بە خۆتان و دەستووره شيركى و ئە نجومەنە بت پەرستييەكانتان بىٚ باوەڕ بووين و كوفرمان پێتانكرد

وە لە نێوان ئێمەو ئێوەدا دووژمنايەتى و ڕق و كينە و بوغز بۆ هەميشە دەستى پێكرد و دەركەوت هەتا ئەو كاتەى ئيمان دەهێنن بە خواى تاك و تەنها و بىٚ هاوەڵ

وصلى الله وسلم على نبينا محمد وعلى اله وصحبه وسلم

## پێڕست

ديموكراسى تەشريع و شەريعەتى زۆرينەيە يان حوكمى طاغوتە، بريتيە لە تەشريع و حوكميان بە گوێرەی دەستور، نەك شتى تر

ديموكراسى بەرهەمى عەلمانى يەتى بۆگەنە

راستى و حەقيقەتى بەژدار بووەكان لە ديموكراسيدا

باسى: رەدو وەلاّم لەسەر شوبهەو گومانە باتلّەكان لەسەر شەرعاندنى دينى ديموكراسى وەلأمەكان لەسەر ئەو گومانانەی كە لە كتێبەكەی عمر الاشقردا هاتووە

گومانى يەكەم: كارى پێغەمبەر (يوسف) لەلای پاشای ميصر

-گومانى دووەم: نەجاشى حوكمى نەكردووە بە حوكمى خوای گەورە لەگەڵ ئەوەشدا موسوڵمان بووە

گومانى سێهەم: ناونانى ديموكراسى بە (شورا) يان ئازادى بيرو را دەربرين

گومانى چوارەم: بەژدارى كردنى پێغەمبەرى خوا (صلى الله عليه وسلم) لە پەيمانى فضول

گومانى پێنجەم: بەرژەوەندى دەعوە و بانگەواز

**بە فەزڵی خوای گەورە تەواو بوو**

**لە دوعای بەخێر بۆ ئيمەو تەواوی برا موجاهيدەكان بێبەش مان مەكەن**

«وَمَنْ يَبْتَغِ غَيْرَ الْإِسْلَامِ دِينًا فَلَنْ يُقْبَلَ مِنْهُ»

# دیموکراسی دینە

هەرکەس شوێن دینێکی دیکە بکەوێت جگە دینی ئیسلام ئەوە لێی وەرناگیرێت

ناگادارکردنەوەی یەکتاپەرستان
لە شوێنکەوتنی ئایینی دیموکراسی و هەڵوەشاندنەوەی ئیمانیان

دانانی
**شێخ ئەبو موحەممەدی مەقدسی**

وەرگێڕانی
**ئیمام عبد اللّٰە**



www.Gizing.net